




دەستەی ڕاوێژکاران
حسێن عارف
ڕەووف بێگەرد
ڕێبین ئەحمەد هەردی

سەرپەرشتی گشتی
شێرکۆ بێکەس

بەرێوەبەری ڕۆڤار
دلشاد عەبدوڵڵ

کارگێڕ
عوسمان شەیدا

مۆنتاجی کۆمپیوتەر
ئاسۆ سعید

7
2000/6/24




**هونەرمەند جەزا بەکر**

1963/لەسلێمانی لەدایك بووە./ 1988/ ئەکادیمیای هونەرەجوانەکانیبەغدای تەواو کردووە./-ئێستا مامۆستایە لەکۆلیژی هونەری زانکۆی سلێمانی/-ئەندامی گروپی هاورێیانی شێوەکارە./-ئەندامی یەکێتی هونەرمەندانی یەکگرتووی کوردستانە.

<u>پیشانگە تایبەتییەکانی:</u>

1994 پێشانگەی (کەڤاڵی چیا)

2000 دووەمین پێشانگای تایبەتی / سلێمانی.

***

1982 -هۆڵی سورکێو./1989-پێشانگای پێشکەش بەپایزی شارەکەم / سلێمانی./1991-پێشانگای ئاوازو ڕەنگی پایز سلێمانی / هەولێر./1992-هونەرمەندانی کورد/ شاری گراتس- نەمسا./1992-پۆستەری تایبەت بە ژیانی منداڵی کورد/ سلێمانی/ سوید/ ئەمەریکا./1992-یەکەمین پێشانگەی لاوان/ خەڵاتی ڕێزلێنانی وەرگرتووە./1994- یەکەمین پێشانگەی هاورێیانی شێوەکار / سلێمانی./1997- هەشتەمی هونەرمەندانی سلێمانی./1997-پیشان دانی کارە هونەریەکانی بەسلاید لە ئەکادیمیای (ئۆتریێخت) لە هۆڵەندا. 2000-پێشانگەی (ملوانکەی چیا) لە(ماسلاوس) و(فلاردینگن) ی هۆڵەندی.

# لە ڕۆڤارەوە بۆ خوێنەرانی

وەك لەیەکەم ژمارەی (ڕۆڤار)دا خوێنەرانی خۆشەویستمان ئاگادار کردۆتەوە کە لەژمارەی داهاتوودا باسی بەرهەمو ژیانی کام داهێنەر دەکەین، بۆ نموونە لە ژمارە (1) دا کە تایبەت بوو بە ئیبراهی ئەحمەد گوتمان، ژمارەی داهاتووی ڕۆڤار تایبەتە بەمحمد مەولود مەمو لەژمارەی (2) دا گوتمان، ژمارەی داهاتوو تایبەتە بەپرۆفیسۆر کەمال مەزهەر لەژمارە (3)دا گوتمان، ژمارەی داهاتوومان تایبەتە بەچیرۆك نووس لەتیف حامد لەژمارەی (4) داگوتمان، ڕۆڤاری داهاتوو تایبەتە بە سوارەی ئێلخانی زادەی شاعیرو لەژمارەی (5)دا گوتمان، ژمارەی داهاتوو تایبەتە بەشانۆ نووس محێدین زەنگنەو لەژمارە (6)دا گوتمان، ژمارەی (7)ی ڕۆڤار تایبەتە بەئەحمەد هەردی شاعیرو لەم ژمارەیەشدا دەڵێین ژمارەی داهاتوومان تایبەتە بە دەرهێنەری بەناوبانگی سینەما (یەلماز گۆنای) خاوەنی خەڵاتی چڵی زێڕین لە فیستڤاڵی (کان)ی سینەماییداو کوردی باکوور.

ئەم ڕاگەیاندنە بۆ ئەوەیە هەموو نووسەرانو خوێنەرانی خۆشەویستی (ڕۆڤار) ئاگادار بکەینەوە کە هەرچی بابەتو زانیاریو وێنەو نامەو دەستنووسی تایبەت بەو داهێنەرانەیان لاهەیە بۆمانی بنێرن تائێمەش بەسوپاسەوە بڵاویان بکەینەوە. چەنکە وەکو هەمووان دەزانین کە کارکردن دەربارەی ژیانو بەرهەمی نووسەرانی پێشوو کارێکی زەحمەتو گرانەو هەندێ جاریش تووشی هیلاکی بێ هوودەمان دەکات کاتێ ماوەیەکی زۆر بەدوای نامەیەك یادەستنووسێك یا زانیارییەك دەگەڕێین دەربارەی یەکێك لەداهێنەران کەچی دەست ناکەوێو ڕەنجەکەمان بەبا دەچێ.

بۆیە جارێکی تر بەپێویستی دەزانین ڕوو بکەینە نووسەرانو ئەرشیف دۆستان کە هاوکاریمان بکەنو (ڕۆڤار) بەنووسینو زانیارییەکانیان دەوڵەمەندبکەن.

لەهەمان کاتدا بەپێویستی دەزانین ئەوەش دووپات بکەینەوە کە ئێمە لە ئامادەکردنی هەر ژمارەیەکی (ڕۆڤار)دا دەیان ناوی داهێنەرانمان بەخەیاڵدا دێو بیری لێ دەکەینەوە هەر بۆ نموونە:

حاجی قادر- شێخ ڕەزا، شێخ نوری، ئیسماعیل بێشکچی، هێمن، سەلیم بەرەکات، حەسەن قزلچی، موحەرەم محەمەد ئەمین، بێکەس، مەحوی، خانی....هتد.

دیارە ئێمە لەکارکردندا تائەوپەڕی ئاسۆی بەرچاو ڕوونی کوردستانینو پێمان وایە ئەدەبی کوردی یەك ئەدەبەو بەهۆی باری سیاسی چۆتە چەند دۆخی جیاوە. بۆیە ئەرکیچکی سەرشانی (ڕۆڤار) لەوەدا دەبینین کەئەدیبانی کورد ئەوانەی خزمەتی کێشەی کوردیان کردووەبگرێتە خۆی.

بەو ئومێدەی لێرە بەدوا هەر دوومانگ جارێك بەرهەمو ژیانی داهێنەرێك بەدیدو باری سەرنجێکی گونجاو بڵاوبکەینەوە، ئەم دوومانگەش تەنیا پەیوەندی بەکۆکردنەوەی بەرهەمو زانیاریو وێنەی ئەرشیفییەوە هەیە کە دیارە ئەم کارە زەحمەتەو وردەکاری زۆری دەوێ.

ڕۆڤار


**(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیریە**

**هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك**

**دەزگای چاپو پەخشی سەردەم هەر دوومانگ جارێك دەری دەکات**

**ناونیشان**

**سلێمانی -فولکەی یەکگرتن -دەزگای چاپو پەخشی سەردەم/ ڕۆڤار**

**ت /** 29839-29609

**لەدەرەوەی کوردستان**

Tel: 0044162846008 Fax: 00441628477660

چاپخانە : ئۆفسێتی دلێر

## ئەحمەد هەردی

# شیعری کاکڵو چرایەکی کوردایەتی

شێرکۆ بێکەس

**هەردی!**
**ناوێك .. لەگوڵی سپیی‌دار هەرمێ جوانترو**
**ژیانێك.. لەبەفری تازە باریو بێگەرد ترو**
**شیعرێکیش .. لەهەناسەی کچو باڵی پەپولە ناسکتر.**
**هەردی!**

لەسەرەتای چرۆکردنی بەهرەو پێڕەوکەبوونی وشەمدا ئەوم ناسی. من ئەو وەختە لەباڵندەیەکی بزۆزی وەك کلك هەڵسەنگێنەی بێ ئۆقرە ئەچووم‌و ئەویش لە دارمێویێکی چڕو پڕی پڕۆپۆ هاویشتووی بەهێشوو قورس بوو لەهەڕەتی پیاوەتیداو، ئەزموونی بەبڕشتیشی سێبەری خۆشەویستی بۆ ئەکردم.

بەر لەبینینی چاوە بەپریشك‌و سەرنجە ووردو تیژەکانی، بەر لەتێکەڵاو بوونی لاولاو ئاسای هەڵزناو بەپەنجەرەکانی بیرو ڕەوشتی بەرزو سپی ئەودا..

بەر لەهۆگر بوونی ڕۆحم بەقسە هێورو داناردانارەکانی.

منی هەرزەکاری تازە سەر لەهێلکە جوقاوی شیعر، عاشقی بۆنی خۆشی کچ‌و شەیدای وشەی تەلیسماویی، ((ڕازی تەنیایی)) یەکەی ئەو کلاوڕۆژنەی خەون‌و ئاوێنەی ژوورو گوڵدانی ژوور سەرم بوو. لەو سیحری زمان‌و شەوقدانەوەی خەیاڵ‌و لەنجەولاری ڕستەو کانیاوی وێنانەوە، زمانی کوردی بوو بەقیبلەیەکی تری بوون‌و چارەنووسم.

کە بۆ یەکەم جاریش لەڕۆژێکی پاراوی بەگیاوگوڵی بەهاری سلێمانیدا، ڕووبەڕوو ئەوم بینی، لە ساتەدا وام هەست ئەکرد، چوومەتە بەر ئەو خەوەی هاتۆتە دی‌و بووم بەهەنگێگی باڵ شیلاوی لەباخچەکانی هۆنراوەی شیرینی ئەودا.

((سوپاس بۆ ئەو ڕۆژەو ئەو ڕێکەوتەو ئەو سەردەمەی ئەوم تیا ناسی))

لەو وەختەوە ئیتر چۆن پەپولەیەك لەخەرمەنی گوڵ نابێتەوەو، خولیا لەعەشق‌و، خەیاڵ لەڕوانینی شاعیر، منیش لەو نەبوومەوە.

ئەوسا منی بێ باوك‌و بێ ماڵ لەبەشی ناوخۆی قوتابخانەیەکدا ((کەلەنسێی هەتاو نەدیو ئەچوو)) فرمێسکی سەر شووشەی پەنجەرەی ئەو ژوورانەبووم کە گریەو کڕووزەی تەنیاییمیان بۆ ژێر نەئەکرایەوەو، هیچ ئاسۆیەکی دڵدانەوەی بەسۆزی دایکم‌و خوشکەکانمیان لێوە دیار نەبوو، لەو دەمەدا ((ڕازی تەنیایی)) هەرتەواو باڵا ئاوێنەیەکی باری دەروونی‌و ژیانی تەنیایی‌و ویردی سەر زاری ڕۆحی شپرزەو کتێبی تەمتوومانی ناو دڵی من بوو.

بەڵام نابینی ئەو ڕەوەزە بەتەنها هەر شیعر پێناسەی نەبوو. ڕاستە شیعر بردمیە بەر گزنگەکانی‌و ئەو زمانەی کرد بەیەکەم پردی پەیوەندی‌و بەستنەوەی من بەگوڵزاری خۆشەویستی ئەوەوە.



بەڵام ئێمە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژیان بەهەموو هیواو ئاڵۆزیەکانی خۆیەوە ڕێچکە پرسیاری لا ئەوروژانم‌و منیش هەفتەو هەفتە بە قژی بڕژو کتێبێك لەبن هەنگڵدا ڕووم ئەکردە گەرەکی گۆیژەو خۆم ئەکرد بەماڵی مامۆستاداو مامۆستایش بەو پەڕی ڕووخۆشی‌و سنگ فراوانی‌و هێوریەوە نەك هەر وەڵامی پرسیارەکانی ئەدامەوە. بەڵکو خۆی چەندین دەرگای تازەی زانیاری جۆر بەجۆری لەسەر عەقڵ‌و هۆش‌وفامی هێشتا نەپشکووتووم ئەکردەوە. کتێبخانەکەی پشت سەری یەکەمین باڵە خانەی پڕ لەهەتاو بوو کەناو بەناو کتێبێکی ڕووناکی ئەکردمەوە. هەر لەو ژورەداو لەسەر زاری مامۆستاوە گوێم لەچەندین چیرۆکی مێژوویی شەلاڵ بەخوێنی میللەتەکەم بوو، هەر لەشۆڕشی دەرسیم‌و ئاگری داغ‌و ڕاپەڕینەکانی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهرییەوە تا ئەگاتە شۆڕشەکانی شێخ مەحمودی نەمر.

بیرمە لەسەر کەسێتی شێخ مەحمود زۆرتر ڕائەوەستاو ئەو یادگاریانەیشیی ئەگێڕایەوە کەوەختێ لەبەغدا خوێندوێتی‌و لەو سەردەمەدا شێخ لەوێ دەست بەسەر بووەو ئەم بەردەوام هاتووچۆی کردووە، باسی فەراسەت ناسی ئەوی بۆ ئەکردین‌و هەموو جارێکیش ئەو لێکدانەوە هەڵەیەی ڕاست ئەکردەوە کە ((گوایە ئینگلیز ویستوێتی کارێ بۆ کورد بکا شێخ مەحمود نەیویستوە)) لەم بارەیەوە ئەیوت ((ئێ باشە ئینگلیز یەکێك لەپیاوەکانی خۆی بکردایە بە حوکمڕان، لەبنەڕەتدا، ئینگلیز بەرژەوەندی خۆی لەوەدا نەبینیوە کە ئەم کارە بۆ کورد بکات))..

ماڵی مامۆستا بۆ من شوێنی هۆشیار کردنەوە بوو.

ماڵی چراکانی کوردایەتی‌و ماڵی بیری کوردستانیی بوو.

ئەو فێری کردم کەمن ئەم نەخشەی کوردستانە بەیەك چاو تەماشا بکەم‌و هیچ جیاوازییەك لەنێوان خۆشەویستی ئەم وڵاتەدا نەبینم هەموو تێڕوانینێکی ئیقلیمی ڕەت بکەمەوەو پێوانەم پێوانەی کوردستانیی‌بێ.

لەزاری ئەوەوەو بۆ یەکەم جار ناوی چەندین کەڵە پیاوی مێژووی نەتەوەکەم بیست. نەك هەر ئەوەندە بەڵکوو بەقوڵی چۆنیەتی سەرهەڵدان‌و گەشەکردنی یەکەیەکەی ئەمارەتە کوردیەکانی بۆ ئەگێڕاینەوە دەست نیشانی هۆکارەکانی پارچە پارچە بوونی ئەم وڵاتەی ڕوون ئەکردەوە تێی ئەگەیاندین ((یەکێتی نەتەوەیی کورد لەیەکێتی بیری کوردستانی‌یەوە سەرچاوە ئەگرێ)). بیرمە لەسالانی 1958/1959دا. ئەوکاتەی لەڕێگەی هەندێ حزبەوە، لەرێگەی پڕو پاگەندەی ڕۆژانەوە شەپۆلی فیکری عێراقچیەتیەکی توند ڕەوانە ئەم بەشەی کوردستانی گرتبۆوە وکار گەیشتبووە ڕادەیەك کەناوی کوردستان هێنان‌و سەر ((لەبەردان وەکو یەك وابوون)). بەتوندی ناولێنانی ((کوردستان)) لەرێکخراوەکانی لاوان‌و قوتابیان‌وئافرەتان جێی گاڵتەی ئەو سیاسەتە چەوتەبوو، مامۆستا هەردی، یەکێك بوو لەو ڕوناکبیرانەی کەبەمەنتیقی زانستی‌و عەقڵی کراوەوە ڕووبەڕووی ئەو لۆجیکانە ئەوەستایەوە-هەر لەو سالانەدابوو، وەك بێتەوە بیرم، زنجیرەیەك موحازەرەی ئەدەبیی بۆ شیکردنەوەی شیعرەکانی گۆران بە هەڵبژاردەیەك مامۆستایانی قوتابخانەکان وتەوە. مەبەستی سەرەکی مامۆستا هەردی لەوتنەوەی ئەو وانانەدا ئەوەبوو، بەتایبەتی لەو سەردەمەدا، کە





شاعیریتی ((گۆران)) لەچاوی ئایدۆلۆجیایەکەوە تەماشاناکریو ئەوانەی لەم ڕوانگەیەوە شیعرەکانی هەڵئەسەنگێنن. بەهەڵە لەهونەری شیعری گۆران گەیشتون. بەڕاستی هەر مامۆستا هەردیش بوو کە بۆ یەکەم جار بەشی کردنەوە هونەریەکانی، شیعری گۆرانی لا خۆشەویست کردم، بەلای ئەویشەوە ئەوەندەی مەزنی گۆرانی لەشیعرەکانی سروشتو جوانیی ژندا ئەبینی کەمتر هەمان گوڕو تینو بەخشینی لەشیعرە سیاسیەکانیدا بەدی ئەکرد. هەر لەزاری مامۆستایشەوە بۆ یەکەم جارو بەدورودرێژی لە ((شیعری مەهجەری عەرەبی))و لەشیعرەکانی میخائیل نوعەیمەو جوبرانو هەروەها لەلایەکی ترەوە لە دنیای شیعری ((ابو قاسم الشابی)) شارەزابووم تەنانەت چەند جار هەر لەبەر بەشێك لەو شیعرانەی ئەخوێندەوە بەئیلقایەك کەتائێستەش لە گوێمدا ئەزرنگێتەوە ((نحن نمشی وحولنا هاتە الاکوان تمشی / ولکن لای غایە؟ هتدد..

هەرلەماڵی مامۆستا هەردیش بوو کە بۆیەکەم جار هەردوو شاعیری ناسراوی کورد شێخ نوری شێخ صالحو فانیم بینی. ئەو هەمیشە باسی چەند روناکبیرو ئەدیبێکی ئەکرد کەلەژیانی ئەودا دەوری لەبەر چاویان هەبووەو هەمیشە ناویانی ئەهێنا لەوانە : فایەق بێکەسو ئیبراهیم ئەحمەد.

من بۆ خۆم لەکەسێتی مامۆستا هەردیدا چەند خاسیەتێك سەرنجی ڕاکێشابووم:

خۆپەرست نەبوو سادەو هێورو لەسەر خۆبوو، بڕیاری پەلەی نەبوو، ئەچووە بنج و بناوانی هەر شتێکەوە کە بویستایە ڕایەکی دەربارە بڵێ سەدجار ئەمدیو ئەودیوی بەمەسەلەیەك ئەکردو لەهەموو ڕوویەکەوە لێکی ئەدایەوە. هەرگیز ڕق ئەستورو توند ڕەو نەبوو، ئاسۆیەکی گەورەی کوردایەتی بەلای ئەوەوە ئاسۆی مرۆڤایەتی بووە، بەوردی گوێی لەهەموو ڕایەکی پێچەوانەی خۆی ئەگرت. کەسی نەئەشکانو لەپاش ملە باسی کەسی نەئەکرد. ئەوەی بیری لێنەئەکردەوە ماڵی دنیاو دەستکەوتی خۆی بوو. کەم کەسم بینیوە ئەوەندە عیزەتی نەفسی بەرز بێ. بیرمە وەختێ بۆ یەکەم جار شۆڕشی ئەیلول بەرپابوو ئەوساتەی لەلایەن جەنگاوەرانی کوردەوە هەردوو دەربەندی بازیانو دەربەندیخان گیرابوون، ئەو ئەم کارەی بەهەڵە لەقەڵەم ئەداو بەووردی ئەوەی بۆ شی کردینەوە کەجیاوازی چیە لەنێوان (شەڕی نیزامی)و (شەڕی چەتەگەریدا) بۆ ئەمەیش نموونەی قسەکانی هەمیشە ئەزموونی چین بوو ئەو پێی وابوو (پێویستە بەرلەهەمووشت شۆڕش لەناو عەقڵی نەوەی کورددا بۆ هوشیار بوونەوە بەرپابێو ئینجا دەست بەریتە چەك) جگە لەخوێندنەوەی بەردەوامی بەتایبەتی کتێبە فەلسەفیەکانو مێژووییەکان یان ئەوکتێبانەی کەباسیان لەچۆنیەتی پێکهاتەی نەتەوەیی میللەتان ئەکرد وەکو یەکگرتنەوەی ئەڵمانیاو ئیتاڵیا بەردەوامیش گوێی لەڕادیۆی B B C ئەگرت کە بۆ ئەو کاتە یەکێك بوو لەکەناڵە گرنگەکانی دەنگو باسو هەواڵی دنیا.

مامۆستا هەردی لەشیوعیەکانی ئەو سەردەمە زیاتر شارەزای تیوریەکانی فیکری مارکسی بوو. ئاگاداری هەموو ئەو بزووتنەوە سیاسیانەبوو کەلە دنیاو ناوچەکەدا هەبوون. من بۆ یەکەمجار لەڕێی زانیاری ئەوەوە زانیم (حزب السوری القومی– الاجتماعی) (ئەنتۆن سەعادە) چیەو پڕۆژەی سیاسیان لەسەر چی بنیاتنراوە. هەر بۆ یەکەم جاریش لەوم بیست ((حزب البعث العربی الاشتراکی)) چیەو چۆن وڵاتی کوردیش بەوڵاتی عەرەب لەقەڵەم ئەدەن. تەنانەت هەر بەعەرەبی ئەو بڕگانەی کەلە پرۆگرامی سیاسیاندا هەبوون لەبەر کردبوو.

لەساڵانی شۆڕشی ئەیلولدا چەند جارێك خۆی هەڵوێستی دلێرانەی چوونە پاڵ شۆڕشو پێشمەرگەی کوردی هەڵبژارد. وەك بیرمبێ لەسەردەمی قاسمدا ئەو یەکێ بوو لەو مامۆستایانەی بەتوندی ڕەفزی ئەوەی کرد هیچ شتێ دژی شۆڕشی کورد ئیمزا بکات. ئەمە لەو کاتەدا بوو کەهەندێ هێزی سیاسی بەناوی دژی کۆنەپەرستیەوە کەوتبوونە ئیمزا کۆکردنەوە. لەسەردەمی یەکەمی بەعسیشدا دواتر لەسەردەمی حوکمی عبدالسلامو عبدالرحمن عارفدا یەکێك لەهۆیەکانی چوونە دەرەوەی مامۆستا هەردی ئەوەبوو، هەڵوێستی جوامێرانەی نێو شاخو داخ هەڵبژێری بۆ ئەوەی ناچار نەبێ بکەوێتە هەندێ هەڵوێستەوە کەزیان بەکەسێتی وەتەنیو ئەدەبی بگەیەنێ. کتێبخانەکەی پڕ بوو لەسەرچاوەی مێژوویی، ئەدەبیو فیکریو هەمە جۆر من یەك دوو جار دیوومە تووڕە بووە ئەویش لەسەر کتێبەکانی بووە. کەدەستکاری کراوە، یان کتێبیان بردووە بۆیان نەگێڕاوەتەوە.

یەکێك لەو پرسیارانەی کە هەمیشە کراوەو ئەکرێ ئەوەیە بۆچی مامۆستا هەردی لەدوای ڕازی تەنیاییەوە نەچۆوە بەلای شیعر نووسیندا، من بۆ خۆم یەکێك بووم لەو مێملانەی کەچەندین جار ئەم پرسیارەم لەخۆی کردووە: بەلای منەوە هۆکاری یەکەم بۆ بڕوای مامۆستا هەردی خۆی ئەگەڕێتەوە کەپێی وابوو: ئەرکی مێژووییو نەتەوەییو وسیاسی گەورەو لەپێش تر هەیە کە پێویستە روناکبیرانی کورد خۆی بۆ تەرخان بکەن، ئەو خەمی نەتەوەیەکی لەخەمی شیعر بەلاوە گەورەتر بوو. هۆشیار کردنەوەی نەوەی تازەی پێ لەپێشتر بوو. هەموو جارێکیش ئەوەی ئەوت ((شیعر یان هەر هونەرێ وەك مەشخەڵێکی داگیرساو وایە لەناو دەروونداُ، کە ئەو مەشخەڵە کوژایەوە جا ئیتر لەبەر هەر هۆیەك بێ، شاعیر بەئاسانی بۆی داناگیرسێتەوە))

لەنێو ئەدەبیاتی کورددا، ئەو ئاماژەی زۆری بۆ بەرهەمەکانی مامۆستا برایم ئەکرد. شیعری نالی ئێجگار بەرز ئەنرخاند. هەمیشە هەڵوێستی ئازایانەی بێکەسی ئەگێڕایەوە چ لەڕاپەڕینی شەشی ئەیلول 1930داو چ لە خوێندنەوەی شیعری بیستو حەوت ساڵەدا بەرامبەر ئەدمونزی موستەشاری ئینگلیز لە گردی مامەیارە، لە چایخانە بچکۆلەکەی (مام صالح)یش کەلەسەر شەقامی مەولەوی بوو. کۆمەڵی ڕووناکبیری ئەو کاتە ڕوویان تێ ئەکرد هەر لەوێ ڕژێك لەڕێی مامۆستاوە پیاوێکی باریکەلەی بێدەنگم ناسی ئیتر بووم بەناسیاوی کە ئەویش مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەر بوو. هەر لەهەمان چایخانەشدا مامۆستایان قادر دیلانو محمد صالح دیلانو کامەران موکریوزۆری ترم ناسی.

من لە کتێبخانەکەی مامۆستاوە کتێبەکانی مێژوونووسی گەورە محمەد ئەمین زەکیو حسین حوزنی موکریانیم وەرگرتو خوێندەوەو لەکاتی خۆیدا ئەمبردنەوەو ئیتر ئەویش کەدڵنیا بوو کتێبەکانی بەسەلامەتی ئەگەڕێنەوە شوێنی خۆیان. داوای هەرکتێبێکم بکردایە دەستی بەڕوومەوە نەئەنا. چونکە بەڕاستی لەو سەردەمەدا کتێبخانەکەی ئەو یەکێك بوو لەکتێبخانە دەوڵەمەندەکان، مامۆستا هەردی زۆربەی زۆری رۆژنامە نووسە جیهانیەکانی ئەناسی تولستوی، تورجنیف، ئەمین زۆلا–بلزاك– باسی ئەکردنو من لەبیرمە بەوردی دەربارەی فاوستەکەی گوتە قسەی ئەکردو تەنانەت هەندێ پەرەگرافی ئەو شاکارەی لەبەر کردبوو.

بێگومان هەندێ جار لەوسەردەمەدا شیعرە کاڵو کرچەکانی خۆمم بۆ ئەخوێندەوە– ئێستە ئەزانم کە چەند کۆڵەواربوون بەڵام مامۆستا گوێی ئەگرتو نەی ئەوت ئەم شیعرانە باش نین. لەجیاتی ئەوەی ڕاستەو خۆ وابڵێت، دەستی ئەکرد بەلێدوان دەربارەی بۆ نموونە شیعرێکی گۆرانو ئیتر تێی گەیاندین کەشیعری جوان چۆنە. بەڵام لەبیرمە لەساڵی 1963/1961دا شیعرێکی خۆم بۆ خوێندەوە، ئەمجارەیان تەماشایەکی کردو پێی گوتم ((ئەم شیعرەت باشە)). ئەبێ ئەوەیش بڵێم لەناو شاعیرە گەنجەکانی ئەو سەردەمەدا ئەو ((جەمال شارباژێڕی)) لەهەمووان زیاتر بەدڵ بوو.

بەداخەوە مامۆستا هەردی لەکاتی خۆیدا ئەو پڕۆژەی نووسینانەی باسی ئەکردن لەمەیدانی باسی مێژووییو یان سیاسی یان ئەدەبیدا نەی ئەخستە سەر کاغەز لەم ڕووەوە سست بوو، من خۆم باشم بیرە کە جارێکیان بیرۆکەی نووسینی ڕۆمانێکی مێژوویی بۆ باس کردم کەپەیوەندار بوو بەیەکێك لەئەمارەتە کوردیەکانەوە چەندین جار پێشبینی سیاسی ئەکرد چەندین جار باسی ئەوەی ئەکرد کەبەشێك لەبیرەوەریەکانی خۆی بنووسێ زۆر جار بەدوروو درێژی باسی بزووتنەوەی کوردایەتی بەتایبەتی لە سەردەمی هیواو ژێ کافدا ئەکرد. لەگەڵ مامۆستا ڕەفیق حیلمیشدا دۆستایەتی هەبوو. خۆشی ئەویست. بیرمە لەکاتێکدا کە ڕاپەڕینی گەلی مەجەڕ دژی دیکتاتۆریەتی سۆڤیەت بەرپابوو. ئەم پێشبینی ئەوەی کرد کە بەئاگرو ئاسن دای ئەمرکێننەوە. مامۆستا لەوکاتانەدا یەکێك بوو لەو ڕوناکبیرانەی کەمەسەلەی (مافی نەتەوەیی بۆ گەلانی سۆڤیەتو جەمهوریەتەکانی ئەویو دیموکراسیەتی داتاشراوی ئەو دەوڵەتەی کەبەدرۆودەلەسەو پڕو پاگەندەی سیاسی ئەزانی) هەموو جارێ ئەیوت (( ئەو دیکتاتۆریەتی پڕۆلیتاریەی باسی ئەکەن هەر دیکتاتۆریەتەو هیچی تر)) یان ئەی وت ((دیموکراتیەتی مەرکەزی پاوان کردنی



ديموكراتيەتەو زاراوەيەكە بۆ ئەوەی ديموكراتی بخنكێنن))

لەناو سەركردە عەرەبەكانيشدا زۆر بەرز جەمال عبدالناصری ئەنرخاند بەڵام مامۆستا پێی وابوو (اتحادی اشتراكی عەرەبی) جەمال عبدالناصر- بەزۆر داتاشراوەو جێگەی ئەو حيزبە ڕاستەقينانە ناگرێتەوە كە لە (قاعيدەوە) بۆ لووتكە ريزەكانی خۆی دروست ئەكات.

من بۆ خۆم ئاگام لەچۆنيەتی دروست بوونی بزووتنەوەی (كاژيك) نی‌يە واتە لەو هەل‌و مەرج‌و كەسانەی كە دەوری سەرەكيان لەم بزوتنەوەيەدا هەبووە بەڵام لەڕێگەی تێكەڵاو بوونمەوە ئەوەم بۆ ڕوون بووە، بەتايبەتی لەساڵانی دواتردا، بەتايبەتی لەڕێگەی مامۆستا فەرەيدون عەلی ئەمينی خزممەوە، كەيەكێك بوو لە لاوە روناكبيرەكانی ئەو سەردەمە، تابڵێی نزيكيش بوو لەمامۆستا هەردی‌يەوە، كەبنچينە نەزەری‌و هێڵە وردەكانی (كاژيكيان) كە بەكتێبی يەكەمی ئەو بزوتنەوەيە لەقەڵەم ئەدرا ، لەلايەن مامۆستا هەردی‌يەوە ڕەنگ ڕێژ كراوەو دواتريش مامۆستا عەبدوڵڵا جەوهەر بەزمانە كوردی‌يە ڕەوان‌و بێگەری‌و گۆڵەكەی دايڕشتۆتەوە. جائيتر جاری تر نوسراوەتەوە يان دەستكاری كراوە من ئاگادری ئەوەيان نيم. ئەوەی ڕاستی بێ مامۆستا هەردی هەرچيەكی كردبی، ئەو كاتانەو دواتريش-سەركەوتوو بووبێ يان سەرنەكەوتوو، بەپاكی‌و جوانی كردوێتی، تا ئێستاش ڕۆژێ لەڕۆژان مامۆستا هەردی هيچ ئيدعايەكی لەم بارەيەوە نەكردووە. ئەم چەند دێڕەشم بۆيە نووسی چونكە لەم دواييەدا شتی سەيرو سەمەرە لەم بارەيەوە نوسران‌و بڵاوكرانەوە.

من بەپێی ئەزموون‌و تێكەڵاوی خۆم لەگەڵ مامۆستا هەرديدا بەر لەدروست بوونی (كاژيك) هەموو ئەو هێڵە ئاساسيانەی لەو كتێبەدا هاتوون، بەدەمی لەوم بيستوون‌و هەر بەدەميش هەموو ئەو بيروبۆچوونانەی بۆ شيكردوومەتەوە. چونكە هەردی بەتەنها هەر خاوەن بەهرەو شاعيرێكی ناسراو نەبوو، بەڵكو ڕووناكبيرێكی گەورەی ئەو سەردەمەی خۆشی بوو. هەميشەيش شەرمی ئەكردباسی هيچ دەورو كاريگەری خۆی لەسەر كەسانی‌تر بكات، خاوەنی هيچ هاشو هوش كردن‌و خۆ هەڵدانێك نەبوو، تا ئەم ساتەوەختەيش هەروايە. هەروەكو ئاماژەيشم بۆ كرد مامۆستا قەد لەپياوە توند ڕەوو دەمارگيرەكان نەبووە ئەو بەردەوام شاعيری لەناخيدا بووەو بەردەواميش شاعيرانەو بەبێگەردی تەماشای هەموو پەيوەنديەكانی نێوان خۆی‌و هاوڕێييەكانی كردووە. ئەو ئەيزانی بە ڕۆمانسيەتەوە نابێ سياسەت بكری‌و بەڵام بۆ خۆشی نەی ئەتوانی خۆی لێ دەرباز بكات.

مەرامی گەورەی ئەم پياوە هەميشە لەهەموو دەورێكدا هەر ئەوەبوو كورد بەيەكێتی ريزەكانی خۆی بگاتە ئازادی‌و هەموو جارێكيش ئەی وت ((ئێمە خاوەنی هيچ شتێك نين‌و نابين تاكورد خاوەنی دەوڵەتی خۆی نەبێ))

ئەوەتەی منيش بيرمە لەڕووی تەندروستی‌يەوەو لەكۆنەوە مامۆستا هەردی نەخۆشی تەنگە نەفەسی لەگەڵدابووە. بيرمە هەر كاتێ ڕەشەباو تەپ‌و تۆز بوايە ئيتر ئەو پەرێشان ئەبوو: بە سروشتيش هەميشە هەر شپرزەو درەنگ بڕيارێكی ئەدا، بەڵام ئەو وەختەی بڕياری لەسەر هەرشتێ بدايە ئەيكردو پاشگەز نەئەبۆوە.

من چەند جارێكيش لەژيانی خۆم دا ئەوم بەپەستی‌و نيگەرانی ديوەو دواتريش بەسەريدا نەخۆش كەوتووە. يەكەميان: ئەوساتەی كوڕە گەورەكەی (دارا) بووبەكارەباوەو گيانی لەدەست دا. دوەميان دوای هەرەسی شۆڕشی ئەيلول‌و تەسليم بوونەوەی پێشمەگە بەئێران و بە عێراق. لەدوای سەرهەڵدانەوەی موقاوەمەيش لە كوردستاندا جارێك لە دانيشتنێكدا وتی ((بەڕاستی ئەمانە كەرامەتی ئێمەيان كڕيەوە)) مەبەستی لە دروست بوونەوەی مەفرەزە سەرەتاييەكانی كۆمەڵەی ڕەنجدەرانی ئەو كاتە بوو. ڕێكەوتووە لەگەڵ مامۆستا چەندين سەفەرمان بە كۆمەڵ‌و بەتايبەتی لەو سەردەمەدا كەسەرۆكی يەكێتی نووسەرانی كورد لقی سلێمانی بوو بۆ بەغداو هەولێرو شارەكانی تر پێكەوە كردووە. خۆ ئەگەر دانيشتن‌و كۆڕێكی بەدڵ بوايە، ئيتر خۆی ئەكەوتە گێڕانەوەی يادگارەكانی. بيرمە هەموو جارێكيش، لەو كۆڕانەدا-كە پەرداخەكەی هەڵ ئەبڕی شيعرەكەی مستەفا بەگی ئەخوێندەوە:-

سەبا ! يارانی مەجليس گەر هەواڵی من ئەپرسن لێت

بڵێ كێشايە مەيخانە دووچاوی بێچووە عەيياری!.

لەنێوان ساڵانی 1965/1956 دا واتە ئەو سەردەمەی كەپێشتر لێی دووام‌و هەموو هەفتەيەك ئەچووم بۆ ماڵەوە بۆ لای- گەلێ جاريش بۆ نانی ئێوارە گلی ئەدامەوە- جاناكرێ لێرەدا دوای ئەو هەموو ساڵانەيش باسی سەعديە خانی هاوسەری مامۆستا نەكەم‌و سوپاسيش بۆ دەست ڕەنگينی‌و چێشتە خۆش‌و بەتامەكانی دووبارە نەكەمەوە، ئەو ژنەی كەلەهەموو تاڵی‌و سوێريەكی ژياندا شێرە ژنانە لەگەڵ مامۆستادا بووەو ئەركی گەورەيش هەر بەسەر شانی ئەوەوەبووە- لەو سەردەمەدا بيرمە هەمووجارێ بەكوڵ‌و لەدڵەوە يادی مامۆستاكانی خۆی‌و ئەو سروودانەی ئەكردەوە كەپێيان وتبوون. من بۆ خۆم چەند جارێ بەدەنگی خۆی سروودی ((ئەی وەتەنی كوردی ئازين))م لێ بيستووە، خۆيشی دەنگێگی گڕی شياو بۆ سروودی پێوە بوو. هەر لەوكاتەيشەوە من ئەو سروودەم لەبەرەو هەرگيز بيرم ناچێتەوە، لەخوێندنەوەو ئيلقاكردنی شيعريشدا كەم كەسم بينيوە ئەوەندەی مامۆستا شيعر بەجوانی بخوێنێتەوە لەمەڕ وشەوە من هەر خۆم بەقەرزاری ئەو ئەزانم كە چۆنيەتی شيعر خوێندنەوەی فێركردم .

لەباسكردنی شاعيرانی عەرەبيشدا، خۆی گێڕايەوە كە لەكاتی خۆيدا لەبەغدا يەك دوو جارێ لەگەڵ ((بدرشاكر السياب) دا دانيشتووە. ئەتوانم بڵێم تەواوی شيعرە درێژەكەی ((ايليا ابو ماضی) ((لست ادری)) لەبەربوو. زۆربەی زۆری چيرۆكە مێژووييەكانی (ئەلسسكەندەر دۆماسی) خوێندبۆوە. بۆ يەكەم جار ئەو باسی رۆمانی (تاوان‌و سزای) ديستوفسكی بۆ كردم. بەر لەهەر كەس ئەو ((پوشكين))ی بەمن ناساند. نووسەری گەورە "ستيفان زفايج" و ڕۆمانە بەناو بانگەكەی (نامەيەك لەژنێكی نەناسراوەوە) ئەو بۆی باسكردم. بيرمە هەموو جارێك ئەی ووت ((پياو شت نەنووسێ بەڵام كەنووسی ئەبێ بەو جۆرە بنووسێ))

چەندين پەرەگرافی نووسينە جوانەكانی مامۆستا برايم ئەحمەديشی لەبەر بوو وەختێ باسی كوردی نوسينی بكردايە ئەوانەی بەنموونە ئەهێنايەوە. بيرمە جارێكيان لەكۆڕێكی چەند كەسيداو هەر لەماڵی خۆيان نيو سەعات زياتر باسی لەو جوانكاريانە كرد كە لەشيعری ((جوانی بێناو))ی گۆراندا هەيە، جياوازی لەنێوان دوو جوانيی جوانيەكی ساكارو سادەو جوانيەكی زەقی بەئاشكرايش. هەر لەو سەردەمەدا ئەوەی گێڕايەوە كە جارێگيان لە مامۆستا گۆرانی پرسيوە: خۆت چی ئەڵێی دەربارەی ئەو شيعرانە واتە جوانی بێ ناوو هەردوو گەشتەكەی قەرەداخ‌و هەورامان يان دەروێش عەبدوڵڵاو لەولايشەوە شيعرەكانی بۆ ميهرەجانی بوخارست‌و هەندێكی تر لەوەڵامدا بەمامۆستا هەردی وتبوو: ((من ئەو شيعرانەی ترم بۆ خۆم نەنووسيبوو)) قەتيش ئەو ئێوارەی هاوينەم لەبير ناچێتەوە كەرێكەوتێكی خۆشی منی لەگەڵ ئەو دووكەڵە شاعيرەدا ، لەچايخانەكەی بەردەركی سەرای (حاجی صالح) كۆكردبۆوە. ئەوان بەگەرمی لەبارەی شيعری كوردی‌و بيرمە بەتايبەتی شيعرەكانی نالی‌و مەحوی قسەيان ئەكردو منيش گوێ قوڵاخ بووبووم.

من لەئەزموونی شيعری مامۆستا هەرديدا جگە لەوەی پوخت بوونەوەی دەربڕين‌و هەوێنی شيعر ئەبينم لەهەمان كاتيشدا هەست ئەكەم ئەو هەر ئێجگار راستگۆ بوو، لەگەڵ خۆيدا چونكە ئەوكاتەی كەزانيوێتی ڕەنگە نەتوانێ بەهەمان بەخشين‌و گوڕو تينی جارانيەوە شيعر ببزوێنێ بێدەنگ بووە. ئەم بێدەنگ بوونە يەكێك لەجوانترين خاسيەتەكانی ئەم پياوە گەورەيە. ئەوەتا بەچەند شيعرێكيش لەبەرزترين ڕەفەی كتێبخانەی شيعری كورديدا ئەدرەوشێتەوە.

هەردی

ناوێک.. شيعری لێ ئەچۆڕێتەوەو

تەمەنێک.. لەئاوێنەی گوڵ ئەچێت‌و

رابوردويەک.. پڕ لەهەڵوێستی جوامێرانەو

مامۆستايەک.. چەندين نەوەی بەبيری پاكی

كوردايەتی گۆشكردو

ئێمەی شاگردی ئەويش ئەومان لەدڵدا هەڵگرتووەو

لەئێستەيشدا تەمەنی لەسەد ساڵ زياتری بۆ

ئەخوازين‌و

بەهيواين بەديداری شاد ببينەوە..

هەردی! باخێک لەجوانی پاكی‌و خۆشەويستی، هەردی!

2000/5/31

***



# ئەحمەد هەردی

کەژێک وتی:

لەڕۆژێکدا هەزار ڕەنگـو هەزار ئاواز
ئاوێزانی باڵم ئەبن
بەردم ئەکەن بەپێشانگاو
درەختم ئەکەن بەشمشاڵ
بەڵام وەختێ کە شەو داهات
تەنها هەر یەکـ دوو ئاوازێ
یەکـ دوو ڕەنگێ
ئەبنە پڵپڵەی خولیام و
لەناو چاوو لەگوێچکەمدا ئەمێننەوەو
لەگەڵ بادا ڕامئەژەنن و
خەیاڵم ئەکەن بە گوڵدان.
« تۆ بڕوانە
پەلکە ڕەنگینەکەی باڵای
ست فاتیمەو
مۆسیقاکەی لەنجەو لاری و
شەپۆلەکانی ناو بەستەی »

کچێک وتی:

بەم ڕۆژگارە هەزار پەیڤی
کوڕی دڵدار
لەباخەڵما ئەمێننەوەو ئەجریوێنن و
لەگەڵ قژما سەر ئەکەنە سەر سەرین و
لە خەویشما
ئەبن بەرێی مانگە شەوێ.
« تۆ بڕوانە
پەپولەن و لەقژمەوە
ئەئاڵێن و
چاوم ئەکەن بەئەستێرکی ئەوینیان و
سنگم ئەکەن بەگوڵجاری فڕینیان و
بەڵام وەختێ کە شەو داهات
ویستم لەتەکـ شیعرا بنووم
هەر بەتەنها دووسێ پەیڤێ
ئەو شەقامەی، چاوەڕوانیی
تیا ئەپشکوێ و تیا ئەوەرێ و
ئەو دنیایەی لەجوانیمدا تواوەتەوەو
ئەو نامەیەی
خواوەندی عەشق بۆم ئەنێرێ»



شیعریش وتی:

بەم ڕۆژگارە هەزار وشەو هەزار ڕستە
ئەبن بەپۆلە باڵندەو
شەقژنیانەو ئەیانەوێ
بگەنە فەزای بڵندم و
مەملەکەتی سیحراوی من بدۆزنەوە.
بەڵام دوایی
هەر بەتەنها چەند فڕێنێ
ئەبن بەورشەی زمانم و
چەند شاعیرێ بەبارانی هەورەکانم و
لەناو فەزای فانتازیما ئەمێننەوە.
«تۆ بڕوانە
«ڕازی تەنیایی»و تەلیسمی
بەرپەنجەرەی وەرزەکانی.
تۆ تەماشای ئەو شۆڕشەی نائومێدیی
بەرپای کردوو، ئەو تانگۆیەی
لەگەڵ خۆیدا لەرەی ڕەنگـو سەمای دەنگـو
زەردەخەنی وشەی هانی»

200/5/29

**شێرکۆ بێکەس**







# ڕووبەڕو
# لە سێبەری چیادا

***چاوپێکەوتنی (هەڤاڵ کوێستانی)یە لەگەڵ (شێرکۆ بێکەس)ی شاعیردا. دیسمبری 1985***

*کۆمەڵە شیعری ((ڕازی تەنیایی)) مامۆستا هەردی لەنێوان چاپی یەکەم و چاپی دووەم دا، چۆن بەراورد ئەکەی؟

-لەزۆر دەمێکەوە وەك تینوی چاو لە ئاو- خوێنەران و شیعر دۆستان و شاعیران چاوەڕوانی ئەوە بوون جارێکی تر چاوو دڵیان بەم بەرهەمە ناسکەی مامۆستا هەردی ڕوون بێتەوە چونکە بەبچوکی خۆیەوە جێگەیەکی دیاری لەدنیای شیعری هاوچەرخی سەردەمێکی شیعری کوردیدا بۆ خۆی کردۆتەوە. بەبڕوای من مامۆستا هەردی بە شیعرەکانی- ڕازی تەنیایی-دەنگ و ڕەنگ و سیما و هونەری شیعرێکی جیاوازتری لەو سەردەمانەدا هێنایە نێو شیعری ویژدانی و ((غەزەل))ی کوردی تازەوە کە لەیەکەم سەرنج دانەوە هەست بەتایبەتێتی ئەکرێ.

دەربارەی چاپی دووەم من لەلای خۆمەوە چەند تێ بینییەکم هەبوو ئەگەر مامۆستام گوێ لەم قوتابییەی خۆی بگرێ. سەرنجەکانیشم پەیوەندیان بە "چۆنیەتی تاقی کردنەوەو سەرهەڵدانی هەندێ شیعرو ئەو بۆنانەی بوونەتە هۆی لەدایك بوونیان یان تەواو کردنیانەوە. هەیە"

پێشەکیەکەی مامۆستا تێکڕاو وەك سەرئەنجام و دوای خوێندنەوەی، ئەو سیحرو جوانی و خەیاڵ و سەرسام بوونەی چاپی یەکەمی شیعرەکان لەو وەختەوە، لەدوای خۆیانەوە، لای خوێنەر بەجێ یان هێشتبوو ئێستە بەو تەفسیرانەی لەپێشەکی چاپی دووەمدا کراون، لەو شەوق و ڕەونەقەی کەم کردوونەتەوە. بەکورتی "باڵای بەرزی ئەو شیعرانە لەئاوێنەی ئەو پێشەکییەدا کورت بوونەتەوە". شیعری زیندو خەیاڵ و تەجروبەی زیندوو ئەیخوڵقێنێ. بەلای منەوە لەبەر ئەوەی مامۆستا هەردی لەئێستەدا ئەو شەیدا بوون و ئەو عەشقەی جارانی بۆ شیعر نەماوە، پێم وابێ کەلە ئێستەدا دێتە سەر باسکردنی تەجروبەکانیش، هەر لەچاوی ئەمڕۆوە تەماشایان ئەکات نەك بەچاوی هەست و سۆزو ئیحساسی ئەوکاتانەی شیعرەکانیان تێدا لەدایك بوون. بۆ وێنە لەشاکارە شیعریەکەی ((شیرین و فەرهاد)) دا فەرهاد بەڕواڵەت و هەر لەبەر جۆرە گرەوێك بێستونی کون کرد، بەڵام عەشقە گەورەکەی شیرین، سووتان و ژان و خەم و پەنگ خواردنەوەی گۆمی ئەو عیشقە مەزنە، ئەو موعجیزەییەیان پێ ئەنجام دا! نەك گرەوەکە! خۆ کەسانی تریش ئامادە بوون ئەو گرەوە بکەن و "شیرین" یان دەست بکەوێ، بەڵام کەسیان عیشقەکەی فەرهادیان لا نەبوو. ئەو گرەوانەی مامۆستام وەك سەرئەنجام ئەیانکات بەهۆی تەواو کردنی ئەو شیعرە ناتەواوانە. بەبڕوای من هەرگیز هۆی بنەڕەتی نەبوون، بەڵکو تەنها دەوری زوو پێش خستنیان- لەتەواوکردنیاندا هەبوەو هیچی تر- مامۆستا تەنها ئەو شیعرانەی تەواو کردووە کە ئەبێ لەدەمێکەوە گەراو خولیای- تەواو کردنیان- لەدڵدا خستبێ و لەئێستەدا بەجۆرێکی تر ئەو موعاناتە سەر هەڵ ئەدەنەوەو زمانێکی هاوبەشی تر لەگەڵ ژیانی ئێستەی شاعیردا دووبارە دروست ئەکەنەوە ئەگینا ئەی بۆچی ئەو شیعرەیانی تەواو کردو ئەوی تریانی تەواو نەکرد؟ هەروەها تەجروبەی شیعری "ست فاتمە" ی بە تەنها لەبەر ئەوە نەبووە گەرم و گوڕو پڕ لەسۆزە چونکە ئەو چەند دێڕە شیعرە ئاساییانەی (ست)ە کانی بەغدا ئیحا گەورەکەی بوون. سۆنگە کاریگەرەکان بوون، بەبڕوای من ئەبێ ڕێکەوتێ بوبێ کەیارمەتی تەقینەوەی ئەوکانیی شیعرەیان دابێت. ئەگینا ئەبێ تەجروبە زیندوەکە نەبووبن. چونکە ئەگەر وابێت مامۆستا ئەیتوانی و ئەتوانێ لەباتی ئەوەی یەك شیعری وەك ست فاتمەی هەبێ دەیانی هەبێت! بەبڕوای من شیعری وەکو (ست فاتمە) هەر ئەبێ خۆشەویستی و عەشق و سۆزێکی گەورە سەرچاوەی بووبێ! خۆ من لەم قسانەشما خوا نەخواستە بەمامۆستا نالێم- تۆ ڕاست ناکەیت- بەقەدەر ئەوەندەی ئەمەوێ بڵێم، لەبەر هەر هۆیەك بێت، کە ڕەنگە لای شاعیر، قەت نەوترێ و هەقی تایبەتی خۆیشی بێت باسکردنی ئەو تەجروبانە، ورد کردنەوەیان بەپێویست نەزانێ و بەو جۆرە دەریبڕیبن.

# لە جیاتی بیبلۆگرافیا

# دڵداریيەكی ناكام‌و ئەزموونێكی بەگەنجی جێماو!

دلشاد عەبدوڵڵا

- ناوی ڕاستەقینەی (هەردی)، ئەحمەدی كوڕی حەسەن بەگی كوڕی عەزیزی كەریم بەگزادەی بابانە، ساڵی 1922 لەگەڕەكی گۆیژەی سلێمانی لەدایك بووە.

باوكی كەسێكی كاسبكاری نەخوێندەوار بووە، بەڵام بەهۆی پەیوەندی زۆرو بەربڵاوی، زۆر شیعری شاعیرانی كوردو فارسی لەبەربووە.

هەردی تاقانەی باوك‌و دایكی بووە، لەڕێی باوكیەوە یەكەم جار گوێی لەشیعرەكانی مەولەوی‌و نالی‌و حافزو حاجی قادرو سالم بووەو هەر لەڕێی باوكیەوە شێخ مەحمودی خۆشویستووەو وەكو خۆی دەڵێ، دواتر لەپۆلی سێی سەرەتاییدا یەكەم جار شیعری بۆ شێخی نەمر نووسیوە.

- هەردی، ساڵی 1930 چۆتە بەر خوێندن لەماڵی عەلی بەگی مەحمود ئاغا لەسابونكەران كە قوتابخانەیەكی سەرەتایی لێ بووە.

ئەوسەردەمە: شۆڕشی ئاگری لەباكور بەئاگرو ئاسن سەركوتكرابوو، سمكۆ لەشنۆ شەهید كرابوو شۆڕشەكەی پەرتەی پێكرابوو، ئینگلیز لەهیندستانەوە شێخ مەحمودی هێنابووەو كرابوو بەمەلیكی كوردستان لەسلێمانی‌و دواتر پەلاماری درابوو، شۆڕشی شێخ كپ ببووە.

هەردی لەناو ئەو واقیعەدا گۆش بوو هەستی كوردستانی لای كەوتبووە جووڵە.

ئەو سەردەمە كارەبا نەگەیشتبووە سلێمانی‌و فانۆس دەخرایە ناو شووشە بەندێكەوەو بەشەقامەكان دا هەڵدەواسراو كرێكارێكی شارەوانی ئێواران ئەو فانۆسەی دادەگیرساند.

لەسلێمانی كۆمەڵەی زانستی كوردان بۆ قەلاچۆكردنی نەخوێندەواری كرایەوە، بەشێوەیەكی ناڕاستەوخۆ لەڕێی هاوڕێیەكی بەتەمەنتریەوە قسەو باسی ئەو كۆمەڵەیە گەیشتۆتە هەردی‌و كاری كردۆتە سەر بیركردنەوەو خوێندنەوەی.

نووسەران‌و شاعیرانی ئەو سەردەمە وەكو پیرەمێردو شێخ نوری‌و بێكەس‌و شاكر فەتاح‌و كەریم زانستی.. دەرسیان لەو كۆمەڵەیەدا وتۆتەوەو هەموو شەوانی سێ شەممەیەك كۆڕی شیعر خوێندنەوەی تێدا بەستراوە. بۆ یەكێك لەو كۆڕانەش هەردی بانگ كراوەو ئەوسا تەمەنی (13) ساڵان بووە، لەبەردەمی بێكەس شیعری خوێندۆتەوەو بۆ تەمایەی ڕەزامەندی‌و ناسینی لەلایەن فایەق بێكەسەوە.

هەردی لەم بارەوە دەڵێ:

ساڵی (1935-1936)، مامۆستا عەلی شەوقی كەئەوسا بەڕێوەبەری قوتابخانەكەمان بوو، بانگی كردم‌و وتی بڕیارە ئەم شەو فایەق بێكەس لەچەمچەماڵەوە بێ‌و ژمارەیەك قوتابی لەگەڵ خۆی بێنێ بۆ شیعر وتن لەكۆمەڵەی زانستیدا ، لەبەرئەوەی بێكەس شیعرێكی زۆری بەقوتابیەكان لەبەركردووە، بۆیە دەبێ تۆش بێیت‌و چەند قوتابیەك لەگەڵ خۆت بێنی بۆ ئەوەی لەوێ لەبەرامبەر ئەوان دا شیعر بخوێنیتەوە.

هەردی دەڵێ: منیش چووم، بۆ یەكەمین جار لەبەردەم فایەق بێكەس شیعرم خوێندەوە، بەبیرم دێ ترجیع بەندێكم خوێندەوە.

بێكەس كەكاتی خۆی مامۆستای هەردی بووە، دڵخۆش بووە بە بەهرەكەی‌و هانیداوە بۆ گەشە كردن.

هەردی دەڵێ: پێی وتم، لام وایە تۆ جێ بەمن لێژدەكەی!

كۆمەڵەی زانستی كوردان خانەیەكی ڕووناكبیری بووە لەماڵی حاجی مەلا سەعید كەركوكلی زادە لەسابونكەران.

- بڕێك لە مامۆستاكانی هەردی: حەمە پاشا، سالح عەلی، ئەحمەد فەخری، فوئاد ڕشیدە فەندی، سالح سەعید، ماوەیەك سالح قەفتان بەڕێوەبەری قوتابخانەیان بووە.
- هەردی زۆربەی شیعری شاعیرانی پێش خۆی‌و سەردەمی خۆی لەبەر بووە، دیوانی نالی بەتەواوی لەبەر بووە، سالم‌و حاجی قادرو زێوەرو بێكەس‌و پیرەمێردو قانع‌و شێخ نوری‌و گۆران. لەنێوان (1930-1936) بەهرەی شیعری هەردی ئاشكرا بووەو لەژێر كاریگەری:

-ڕۆژنامەی ((ژین)) كەئەوكات پیرەمێرد شیعرەكانی تێدا بڵاو دەكردەوەو باسی بۆنەكانی نەتەوایەتی‌و نیشتمانی دەكرد.

-شیعری شاعیران كە وەكو لەپێش دا باسكرا هەردی زۆربەیانی لەبەر بووە.

-ئاهەنگی نەورۆز: ئەو سەردەمە نەورۆز لەكارێزی حسێن عەزیز ئاغا (شوێنی خانووە قورەكان) دەكرایەوەو سێ شەوو سێ ڕۆژ چادر هەڵدەدراو شایی‌و هەڵپەڕكێ‌و سرودو گۆرانی گەرم دەبوو شیعر دەخوێندرایەوەو ڕمبازی دەكرا.

- هەردی ساڵی 1935 شیعرێكی لاسایی یا (نظیر یا معارەزە)ی لەسەر شیعرێكی زێوەر نوسیووەو بەم شێوەیە:

بەهۆی گوڵی شیرینی پڕ گوڵاوی لێوی ئاڵەوە
دڵداری چەشنی بولبولان ئەخاتە شین‌و ناڵەوە
وەنەوشە شۆڕی كرد سەری لەعەزرەتا گوڵ هەڵوەرێ
شەو بۆ لە بۆ بوو بێ‌بەری بەزوڵف‌و كوڵم وخاڵەوە.

بەشێكی زۆری شیعرەكانی ئەو سەردەمەی هەردی دیار نین، هەردی دەڵێ: ئەوسا هەفتەی شیعرێكم دەنووسی.

- دوو دیمەن: (كاریگەری عوسمانلی‌یەكان)

1-بێكەس گێڕاویەتەوە: بۆیە شیعری (تۆ چیت مـن كـوردم)ی بۆ منداڵان نووسیوە، چونكە ڕۆژێكیان لەچەمچەماڵ لەمنداڵێكی هەمەوەندی پرسیووە. تۆ چیت، وتوویەتی، من توركم! ئەوەش لەژێر كاریگەری مامۆستایەكی تۆرانی دا بووە كەئەوسا لەكەركوكەوە هاتۆتە ئەوێ‌و دەرسی بەقوتابیان گوتۆتەوە.

2-هەردی دەڵێ: مامۆستا فەهمی قەفتان بۆ كەشافە ئێمەی ئەبردە لادێكان تا ژیانی ئەوێ ببینین، دەیبردین بۆ هەزار مێرد، بۆ سیتەك، بۆ وێڵەدەر.. ڕۆژێكیان لەسەر شاخی گۆیژە بووین، پشوومان دەدا قوتابیەك لەمامۆستا فەهمی پرسی: كام میللەت ئازاترین میللەتی سەر زەوین؟

ئەویش وتی، ئەم پرسیارە سەیرە! چونكە میللەتی ئازا زۆرن‌و ناكرێ بڵێین فلانە میللەت ئازاترینیانە.. قوتابیەكە وتی، مامۆستا دەڵێن (تورك) ئازاترین میللەتن! كەمامۆستا چووە بنج‌و بناوانی قسەكەوە زانی مامۆستایەك كاتی خۆی ئەو زانیاریەی فێر كردوون سەر بەعوسمانیەكان بووە، ئەویش كەوتە باسكردنی ئەو زوڵمەی تورك لە كوردی كردووەو باسی شۆڕشەكانی كوردی بۆ كردین.

- (هەردی) لەقۆناغی دووەمی شیعر نوسینیدا، (1938-1939) كەوتۆتە ژێر كاریگەری ئەدیبانی لوبنانی ئەوانەی كەوتبوونە ئەمەریكا‌و لەوێ لە تاراوگە دەژیان‌و بە (ئەدیبانی مەهجەر) ناسراون، لەوانە جبران خلیل جبران‌و میخائیل نوعەیمەو ئەبو قاسمی شابی.

(هەردی) لەژێر كاریگەری ئەوان دا بووە، تا بۆ نـاز ناوەكەشی ئیلهامی لە ئەزموونی ئەوان وەرگرتووەو هەردی بەمانای تەنیایی‌و تەریكی هەڵبژاردووە.

- ساڵی (1938) لەشەقلاوە لەماڵی یوونسە فەندی كە ئەوكاتە لەحزبی هیوادا بووە خزمی هەردی بووە، یەكەمین جار برایم ئەحمەدی لەوێ ناسیووە. پەخشانێكی لەژێر كاریگەری نووسینەكانی جبران نوسیووەو بۆ برایم ئەحمەدی خوێندۆتەوەو ئەویش سەرنج‌و تێبینی خۆی پێ وتووەو هانیداوە كە وردترو بەدیقەتر بیربكاتەوە، ڕستەكان دابڕێژێت.









دەربارەی کاریگەری برایم ئەحمەد، (هەردی) دەڵێ:

برایم ئەحمەد، فێری کردم باش بیربکەمەوە، یەکەمین جار لەشەقڵاوە ناسیم ئەوکاتە خۆی بۆ گۆڤاری (گەلاوێژ) ئامادەدەکردو دواتریش لەسلێمانی سەردانیم دەکرد، جارێکیان لای (گۆران) بینیم لە ئەشغالی سلێمانی، (گۆران) لەوێ محاسب بوو.

برایم ئەحمەدو گۆران هاوڕێ بوون بەڵام لەبیرو باوەڕدا جیاوازو پێچەوانەی یەکتر بوون. برایم ئەحمەد چەپ بوو، هەرچی گۆرانە باوەڕی بەدیموکراتیەکی لەشێوەو، ترازی ئینگلیزی هەبوو (دیموکرات لیبرالی). جۆری خوێندنەوەکانی گۆران جیاواز بوو ئەو کتێبی ئەحمەد ئەمین و جەماعەتەکەی زیاتر دەخوێندەوە.

- سالّی (1939) هەردی ماوەیەك لەنوسین وەستا، دەربارەی ئەو وەستانە خۆی دەڵێ:

پێشتر شیعرم زۆر دەنووسی، برایم ئەحمەدو گۆران فێریان کردم بەحەزەرو ترسەوە بنووسم و بەدیقەت بیربکەمەوە. خۆیشم ئەو ماوەیە ئەو کتێبانەم دەخوێندەوە کە زیاتر ڕەخنە یان تێدا بوو. ماوەیەك ئەو کتێبانە ساردیان کردمەوە لەشیعر نووسین.

ئەوانە هەمووی بەسەر یەکەوە وایان کرد هەردی نووسینی کەم بێتەوەو زیاتر بخوێنێتەوە. هەمیشە ڕەخنەو چوونە ناو جیهانی بیرو عەقڵ، گوڕو تین و شەفافیەتی شیعرو شیعریەت کەم دەکاتەوە.

دڵەڕاوکێ و بەحەزەر نووسین کارێکی دوو سەرەیە، ڕەنگە بۆ ماوەیەکی کورت باش بێ بەڵام کەبووە خوو درێژەی کێشا بەشێکی بەهرە دەفەوتێنێ.

- دەربارەی بەرهەم و شیعرەکانی :

ئەزموونی شیعریی هەردی چەند بەرزو شیك و دەوڵەمەندە لەشێوەو دەربڕین داو ڕچەشکێنە لەبەخشینی مانادا، هێندە جوان و سەرامەدە لەبێدەنگ بوونیشدا، ئەو بێدەنگی یەی، هەڵبژاردنی کەمترنی یە لەداهێنان. ئەو شاعیرانەی ماوەیەك شەنگ و تاقەتی داهێنانیان دەبێ ئیتر کە دەزانن خۆیان دووبارە دەکەنەوەو هیچی تر ناخەنە سەر ئەزموونی شیعریان بێدەنگ دەبن، ئەو شاعیرانە هەمیشە حورمەت و ڕێزیان زیاترە لەوانەی بەئەزموونێکی باشەوە دێنە پێش و دواتر بەخۆ خواردنەوەو بەرهەمی کاڵ و کرچ ئەزموونەکەیان لەباردەبەن و سەر لەخوێنەر دەشێوێنن و ڕێگەی ئەوەیان لەبەردەم دا دەبەستن کە بەچاوی جوانیەوە تەماشایان بکەن.

هەردی لەو ئەزموونە کورتە بەبڕشتەی خۆیدا جۆرە شیعرێکی دڵداری داهێنا کەپێشتر لای کورد وێنەی نەبووە، دواتریش کە ڕەگەزو هەستی چینایەتی تێکەڵ بە شیعرو خۆشەویستی کرد ئەزموونی شیعری خۆی دەوڵەمەند تر کرد:

ئەو بەتەنیا بۆ گوڵی سەرمێزی بادەی تۆی ئەوێ
هەر کە جارێ بۆنی کردی، جا گوڵێکی نوێی ئەوێ

ئەویەئس و بینینی ڕاستی و دەربڕینە ناسك و جوانە بەهرەمەندی هەردی دایڕشتووە.

هەردی دەڵێ:

پایز بوو، دڵم تەنگ بوو، زۆر بەعەفەوی شیعری (شۆڕشی نائومێدی)م نووسی، کەچی شیعری (ئەو دڵەی وەك بت پەرستێ) زادەی موناقەشەیەکی زۆر بوو، کەپێشتر دەیانووت دڵداری شیعری تیا ناوترێ و باسی جیاوازی چینایەتی لەشیعری دڵداریدا ناکرێ من ئەو شیعرەم پاش ئەو موناقەشانە نووسی. ئەو کات ڕەمەزان بوو، لای گاوران، لەخوار ئاشەکەی گاوران، چایخانەیەك بەچیغ دانرابوو، لەوێ لەسەر بەرگی پاکەتێکی جگەرە ئەو شیعرەم نووسی .

بەو واتایە هەردی هەندێ جار بە(تصمیم)و پڕۆژە شیعری نوسیووە، وەکو چۆن هەندێ شیعریشی ئەو پەڕی عەفەوییەتیان تێدا بووە.

هەردی دەڵێ: ساڵی 1938 کەمالی جەلال سائیب بەهەڵە لەجێی باوکیدا کوژرا لە رانیە، کەتەرمەکەیان هێنایەوە هاوین بوو، من لەحەوشەی ماڵەکەمان دانیشتبووم، تەمەنم 16 ساڵان بوو، ئەم چەند دێڕەم نووسی:

**بای ئەجەل هات و لەناکاو دەفتەری ژینی دڕیم**
**تاکو دوێنێ خونچە بووم ئەمڕۆ بەناهەق هەڵوەریم**
....هتد

کەپیرە مێرد گوێ بیستی ئەم شیعرە بوو، وتی، ئەم شیعرە لەسەر کێلی گۆڕەکەی کەمال بنووسن و کەوابێ من هیچی بۆ ناڵێم.

ئەو شیعرە شۆرەتی بۆ هەردی پەیدا کردووەو هەرکەسێ ئازیزێکی مردووە داوای کردووە هەردی شیعرێکی بۆ بنووسێ، ئەمەش بۆتە مایەی ناخۆشی و هەراسان بوونی هەردی.

- هەردی ئەزموونی شیعری خۆی کردۆتە سێ قۆناغ:

-کلاسیکی کە ماوەیەکی کورت بووەو لەژێر کاریگەری شیعرەکانی زێوەرو نالی دا شیعری وتووە.

-(1938-1939) ڕۆمانتیکی، لەژێر کاریگەری ئەدیبانی مەهجەر.

-ریالیزم: تێکەڵ کردنی ڕەگی چینایەتی لەگەڵ خۆشەویستی و دڵداری، هەندێ سروودی نیشتمانی و بیری کوردستانی.

- هەردی لە شیعرەکانیدا هەر وەکو لەبیر کردنەوەشیدا کوردستانی بووە پاکو هەڵوێست بەرزو سەر ڕاست بووە، خۆشەویست بووە لەناو خەڵکدا، چەندین شیعری حەماسی و نیشتمانی هەیە تا ئەم نزیکانەش وێردی سەر زاری خەڵك بوون.

- ست فاتمە یەکێکە لەشیعرە دیارەکانی هەردی، هەروەها بەشی زۆری شیعرەکانی کراوەتە گۆرانی و گۆرانیبێژە ناودارەکانی کورد گوتوویانە لەوانە عەلی مەردان،کەریم کابان، ئیبراهیم خەیات، ئەمەش شۆرەتێکی زۆرتری بۆ هەردی دروست کردووە.

- ساڵی 1977 بەدەستپێشخەری د.مارف خەزنەدار دیوانە تاقانەکەی (رازی تەنیایی) هەردی چاپکراوەو ساڵی 1983 جارێکی تر هەردی هەندێ لەشیعرە تەواو نەکراوەکانی ئەوسای دوای زیاتر لەسی ساڵ تەواو کرووەودیوانەکەی بۆ جاری دووەم بەهەمان ناوی پێشوو (ڕازی تەنیایی) چاپکردۆتەوەو هەمان گیانی شیعری جارانی تێدا پاراستووە، بەڵام ئەو پاراستنە بەتەنیا، خاڵێکی سلبی‌یە لە ئەزموونی هەردی‌دا، چونکە پرسیارەکە ئەوەیە مادامەکی هەردی دەینووسێ دەبووا شیعری تازە بنووسێ نەك شیعرە تەواو نەکراوەکان تەواو بکات.

من خۆم چەند جارێك شیعرە تەواو کراوەکانی دوایم خوێندۆتەوە، هەمان جوانی بەڵام ئەزموون و وەستاییەکی زیاترم تیایاندا ڕەچاو کردووە، ئەوە گومانی ئەوەی لا دروست کردووم کە بێ تاقەتی و یەئس و دڵە ڕاوکێ گەورەترین بەربەست بوون لەبەردەم ئەزموونی هەردی‌دا، هەردی دوای ئەو سی ساڵ وەستان و بێدەنگیەش هەروەکو شاعیر ماوەتەوە.

(پیرێکی جوان و ئەزموونێکی بەگەنجی جێماو) ئەوە جوانترین ڕستەیە کە کتومت تەعبیر لەهەردی دەکات.

- زەحمەتە بەشیعرێ بڵێی شیعری شارو بەشیعرێکی تر بڵێی شیعری لادێ، چونکە سیفەتی یەکەمی شیعر شیعرییەتە، ڕەنگە ئەوانی تر سیفەتی دواترو لاوەکی بن، لەشیعری شاردا، وشەو خەیاڵ و وێنەکان چەندین ئاستی جیاوازو زیاترلە ڕەهەندێکیان هەیە.

هەردی لەسوچی دڵداری و ڕەوشت و ژنەوە، بەسوود وەرگرتن لە ئەزموونی دڵدارییە ناکامەکانی خۆی و قەناعەتە فیکرییەکانی، ئەزموونی شیعری شاری بەنەسەقێکی شیك داڕشتووە، ڕستەو وێنە شیعرییەکانی زادەی پەیوەندییەکانی شارن.

- هەردی ساڵی 1973-1974 لەکۆلیجی ئەدەبیاتی زانکۆی سلێمانی مامۆستا بووەو ڕەخنەی ئەدەبی گوتۆتەوە، بەداخەوە محازەرەکانی تائێستا چاپ نەکراون کە کاکڵەی لێکۆڵینەوەو گەڕان وخوێندنەوەی ئەو شاعیرەن.

- ماوەیەك خەریکی لێکۆڵینەوە بووە دەربارەی کێش لەشیعری کوردیداو تائێستا بەرهەمەکانی لەم ڕووەوە ڕوناکیان نەبینیوە.

- ساڵی 1941 بۆتە مامۆستاو دوای چل ساڵ خزمەت خۆی خانەنشین کردووە، ماوەیەك ئەندامی دەستەی بەڕێوەبەری یەکێتی نووسەرانی کوردو سەرۆکی لقی سلێمانی بووە.

- نامیلکەیەکی دەربارەی زمانی ئەدەبی یەکگرتوو هەیەو چاپ نەکراوە.

- ئێستا لەلەندەن دەژی.

*ئێستا لەلەندەن دەژی.

لەتیف هەڵمەت لەگەردەلوولی سپیدا شیعرێکی بۆ نووسیوەو دەڵێ:

**لەوڵاتی غەریبیدا کێ دەتناسێ!**

---

سەرنجێك:

هەندێك زانیاری لە بارەی ژیانی هەردی‌یەوە لەو چاوپێکەوتنە وەرگیراوە کەتای خۆی لەهەشتاکاندا لەماڵی خۆی‌دا لەگەڵیان کردەو بڵاویش نەکراوەتەوە.

# پێشەكی

# دیوانی

# ڕازی تەنیایی

مارف خەزنەدار

سڵاو بۆ كوردستان،

بۆ ئەو خاكە ڕەنگینەی ((كە تۆزی وەك جەواهر، سورمەیی نووری بەصەرتانە..)) ئەو كوردستانە پیرۆزەی ئێمەی میراتێكی ئەدەبی و هونەری گەلێ بەرزو بەنرخی بۆ نەتەوەی كورد بەجێ هێشتووە. هەروەها بۆ هەموو نەتەوەكانی تری گێتیش ئەگەر سوودی لێ وەربگیرێ، بە گۆڕینی بۆ زمانەكانی تر. ئەگەر چاو لەهەموو شتێكی خۆمان بپۆشین، لە شارستانیەتی (میدیا)، لەجوانی و بەرزیی زمانی كوردی، لەڕابردووە پیرۆزەكەمان لەمێژووە بەرزەكەمان، تەنها ئەو بیرو هەستەی كە بە كوردی نەتەوەی كوردستان خستوویەتی‌یە سەر كاغەز جێگای شانازیو سەر بڵندی‌یە.

لەسەدەی نۆزدەمی میلادی‌دا، شیعری مەدرەسەی تەقلیدی ئەدەبی كوردی گەیشتە ئەو پەڕی بەرزبونەوە، لەلایەن فەنی‌شیعری‌یەوە، ئەم چەشنە شیعرە بەهێزەی كوردی دوولقی لێ بووبووەوە، لقێكیان لە ئاسوییێكی تەسكوترووسكا ئەژیا، وە شاعیر هەوڵی ئەدا كەسۆزی دەروونی خۆی بكاتە ئامانجی شیعری، دوور بێ لە كۆمەڵ، لەكۆمەڵی كورد، لەبیروباوەڕی گشتی، ئەگەر چی جارجارەش ئەم شاعیرانە تەقەلای ئەوەیان ئەدا كە پێ بزێوی بكەن بۆ ئەم لایە. ئەم چەشنە شیعرە كەوتە خۆ بۆ قۆزتنەوەی ووشەی زلو پڕ مانا، ووشەی فارسیو عەرەبی، پەیڕەوی كردنی ئەوزانو قافیە زیاد لەئەندازە، قارەمانە هەرە بەرزەكانی ئەم مەیدانەی مەدرەسەی تەقلیدی كوردی‌یە، نالی، سالم، كوردی، مەحوی، وەحەریقو هی تری بوون.

زۆرو ستەمی دەسەڵاتی عوسمانی بەرامبەر بەكورد هۆییەكی گەورە بوو بۆ گرژكردنەوەو پێوەدانی دەرگای ئیلهامی راستەقینەی شاعیرەكان لەم دەورەدا، وەكو ئەڵێن، شاعیریش ئەبێ شیعر هەر بڵێ لەبەر ئەوە لە ناو گێژەڵوكەی چەند مەبەستێكی تەسكا ئەخولایەوە، وەلەبەر ئەوەی كەبەشی زۆری هونەری شیعری بۆ ڕازاندنەوەی شێوە تەرخان كردبوو، توانی وەزنی زۆر بەهێز دابڕێژێ، وەقافیەی زۆر جوان بۆ شیعرەكانی دروست بكا.

بەڵام لقەكەی تری مەدرەسەی تەقلیدی ((حاجی قادری كۆیی)) بە تەنیا ئەو پەردە پۆڵابەندەی كەبیروباوەڕی شیعری كوردی تیایا بەند كرابوو دڕی، بێ گومان نرخی ئەو ڕاپەڕینەش بۆ ژیانی ((حاجی)) زۆر گران بوو... ((حاجی)) هەستو باوەڕێكی تری هێنایە ناو مەیدانی شیعرەوە، وە خووی دایە فراوان كردنی ماناو بەكارهێنانی بۆ چاك كردنی باری نەتەوایەتی و كۆمەڵایەتی قەومەكەی خۆی، پشتی كردە جوانی و ڕازاوەیی شێوە، لەبەر ئەمە ((حاجی)) چەنجد خزمەتی كوردی بەو شیعرە كۆمەڵایەتی‌یانەی كرد، كە وێنە باوەڕی كورد بوون لەو چەرخەدا، ئەوەندە شیعرەكانی لەنگ، وە ووشەكانی بێ هێز، وە دوور لەهونەرێكی بەرز بوون. لێرەدا مەبەستم شیعرە نیشتمانیەكانیەتی، نەك غەزەلەكانی.




لەم سەدەی بیستەمەدا بزوتنەوەو ڕاپەڕینی میللەتان تینی سەند، كورد لەمەدا بێ بەش بوو، تائەندازەیەكی زۆر هاوبەشیی كرد لەخۆش كردنی گڕی ئەو ڕاپەڕینە میللی‌یانەدا، وەشیعری كوردی لەم مەیدانەدا هۆییێكی بەرز بوو بۆ بەهێز كردنی بیری كۆمەڵایەتی. جارێ لەپێشا شاعیری كورد قاڵبی كۆنی شیعری هەر هێشتەوە، بەڵام هەستو باوەڕی گۆڕی، سۆزی دەروونی ڕشتەناو عاتیفەی قەومی‌یەوە، وە ووردەووردە زانیاری لەكانیاوی خوێندەواریی گشتی گێتی هەڵمژی، ئاسۆی مێشكی فراوان بوو، وەچاوی كرایەوە. شاعیرە بەرزەكانی ئەم دەورەمان، هەندێكیان كۆچیان كردوە– ڕووناكی بۆ گۆڕیان––، وە هەندێكیان هەرماون–ژیانیان بمێنێ–، لەمانە پیرەمێرد، زێوەر، احمد موختار، بێ كەس، دكتۆر كامەران، شێخ سەلام، جگەر خوێن، وەهەژار،وەهی ترن. شیعری تازەی كوردی لە ((گۆران))ەوە دەست پێ ئەكا، جا ئەگەر ((هەردی)) هاوڕێی دەستە ڕاستی ((گۆران)) بێ، جوانەمەرگی ئەدەبی كوردی ((دڵدار)) هاوڕێی دەستە چەپی بوو.

((هەردی)) شاعیرێكی ناسراوی كوردە، هەر چەندە تا ئێستا تەمەنی لاوی بەڕێ نەكردووە بەڵام لەگەڵ ئەوەشا سەیر نیەكە دیوانی ((ڕازی تەنیایی))لەچەند لاپەڕەیەكی كەمدا جێگەی بووبێتەوە، وە ئەتوانین بڵێین بێجگە لە چەند پارچە شیعرێكی‌نیشتمانی كە بەپەنجەی دەست ئەژمێررێ ئەم دیوانە هەموو بەرهەمی شیعریەتی.



((هەردی)) لە ((چاوەڕوانی بێ هودە))دا نمونەیێکی ڕەمزی چیرۆکی ڕاستەقینەی دڵداریمان بۆ ئەگێڕێتەوە. بەڵێ، ئەم پارچە شیعرە- لەگەڵ ئەوەی کە کەمیشە- داستانە، چیرۆکە بەشیعر ووتراوە ئێمە ئەگەر ((ووشە))کانی (هەردی) لەو لاوە دابنێین، چونکە ئەبێ ووشەی هەردی پێ بڵێین، ئەبینین بیرو خەیاڵو ئیلهامێکی تایبەتیشی هەیە، لەهەندێ‌کاتا مانا دروست ئەکا، وە لە هەندێ کاتی ترا، مانای دروست کراو وەرئەگرێ، بەڵام بە داڕشتن‌و خەیاڵو ووشەیەکی تازەی وا، کە وەستایەتی ((هەردی)) لێرەدا لەوە کەمتر نیە کە بۆ ماناتایبەتی‌یەکانی خۆی پەیدا کردووە.

فەلسەفەی ئەفلاتوونی یۆنانی لەسەر باوەری ((مطلق) دامەزراوە، ئەڵێ: (بون-کون)وێنەی ئەو (مطلق)ەیەدروێشەکانی ئیسلامیش بە هەموو تیرەکانیانەوە لەسەر ئەو باوەڕەن، وە ((مطلق)) بەشتێکی جوان‌و خاوێن‌و پاك ئەزانن، وە لەسەر ئەو باوەڕەشن کە شێخە گەورەکانیان وێنەی ڕاستەقینەی ئەو ((مطلق))ەن لەبەر ئەوە ئەبینین هەموو شاعیرە دەروێشەکانی ئیسلام خەریکی ووشەی ((جوان- جمال))ن، وە هەموو (بوون-کون)وە (بزوتنەوە- حرکە)یێك ئەکەن بەشتێك کەلەو جوانی‌یەدا کە (مطلق)ە دەر ئەچێ جا ((هەردی)) کە ئەڵێ

سەرنجی ڕێ ئەدەم، ڕێگا
هەموو شێوەی ئەوی تیایە
وەکو دنیا لە ناوجوانی
ئەوا توابێتەوە، وایە

لێرەدا لام وایە مەبەسی ئەو (مثالیة)تە نیە کە ئەفلاتوون باسی ئەکا، وە دەروێشەکان لەسەری ئەڕۆن، بەڵکو شێوەی فەلسەفەی ئەفلاتوونی بەکار هێناوە بۆ دروست کردنی ئەو وێنە (حسی)یە باڵایە. جائەگەر بیرو خەیاڵی خوێندەوار لەشیعرە دەروێشی‌یەکانا بڕوا بۆ لای شتێکی خەیاڵی‌ی نەبینراو، هیچ گومانم نیە لەلای ((هەردی)) ئەم بیرو خەیاڵە ئەڕوا بۆ لای شتێکی هەبووی بینراو، ئەو شتەش با کچە کوردێکی جوانی نازدار بێ کەخۆی لەعەباوە پێچاوە بەناو کۆڵانەکانی سلێمانی یا تێپەڕ ئەبێ، وە ((هەردی))یش هەر چاوەڕوانیەتی هەتا ئاوی پێ‌ی دایێ.

باباتاهیری هەمەدانی کوردیش (935م-1010م) هەر لەم مانایەدا ئەڵێ:

بەدەریا بنگرەم، دەریا تو مەینەم
بەسەحرا بنگرەم سەحرا تو وێنەم
بەهەر جا بنگرەم کوەو دەرو دەشت
مەگەر ئاندەم کەزیبایی تووینەم

باباتاهیر، جوانی‌ی خۆشەویستەکەی، (یاخود ((مطلق)) بڵێین چاکترە) لە هەموو جێگاییێکا ئەبینێ، هەموو شتێك هەر خۆشەویستەکەی ئەوە، بەڵام ((هەردی)) دڵداری‌یەکەی لە باباتاهیر بەهێز ترە، چونکە لەرادەی وەسفەکەی باباتاهیرا نەوەستاوە، ئەبینین لەشیعری یەکەمیا وەك باباتاهیر ئەوەش خەیاڵ ئەکا کە خۆشەویستەکەی هەر هاتووەو گەورە بووە تابووە بەدنیا، بۆیە تەماشای هەرکوێێکی کردووە شێوەی ئەوی تیا بینیوە، بەڵام لەدێڕی دووەمدا دنیا هەر هاتووەو بچووك بۆتەوە تا بووە بەخۆشەویستەکەی. ((هەردی)) ئەم دوومانا جوانەی لەم شیعرەدا کۆکردۆتەوە، لەشیعری ئەوروپاییشا نمونەی وا گەلێك زۆرە. هەردی هەر لەو شیعرەدا ئەڵێ:

شنەی با باسی جوانی ئەو
بەگوێ‌ی من دا ئەچرپێنێ

خۆشەویستەکەی ((هەردی)) تەنها ئەو شتانە نیە کە بەچاو ئەبینرێن (المرئيات)، بەڵکو حەتا مادەی بەچاو نەبینراو(غير مرئی)یش، کە (بایە)، ئەگەر خۆشەویستەکەی ئەو نەبێ، باسی جوانی‌ی خۆشەویستەکەی ئەکا، وە دەنگی (با)ئەبێتە دەنگی خۆشەویستەکەی یاخود بۆنی دلبەرەکەی بۆ ئەهێنێ.

لەشیعری عەرەبیشا مانای وا ئەبینرێ، بەتایبەتی لای شاعیرەکانی (الغزل العذري)ی دەوروبەری دەوڵەتی بەنی ئومەیە، وەکو ((قيس بنی عامر))و ((جميل بثينة))،و هی‌ترا.

دیسانەوە هەر لەو شیعرەدا، ((هەردی)) ئەڵێ:

ئەگەر چی وەك خەیاڵی من عەبا دەوری لەشی داوە

ئەم مانایە دەستکردەی شاعیرە، لەئەدەبی ئەوروپایی‌دا مانای وانیە، لام وایە لەبەر ئەوەشە چونکە عەبا لەوێ نیە، وەلەشیعری عەرەبیشا ئەگەر چی چەند جارێ شاعیر عەبای بەکارهێناوە لەشیعرا، بەڵام بۆ ئەو مانایەی ((هەردی)) هەر نەڕۆیشتووە، لێرەدا شاعیر کە ئەڵێ: (عەبا دەوری لەشی داوە)،بێ گومان ئەمە وەسفێکی (حسی مادی)یە بەم وەسفە خەیاڵەکەشی (تجسيد)کردووە، یاخود هەر خۆی عەباکەیە بەڕاستی ئەمە ئاوڕدانەوەییێکی هونەری‌ی بەرزە. لەشیعری ((شۆڕشی نائومێدی))یا، شاعیرفەلسەفەییێکی تازەی خستۆتە ناو ئەدەبی کوردی‌یەوە، نوێشکی ئەم مەدرەسە شیعری‌یە ئەوەیە، کە دڵداربەتایبەتی لەو کاتانەی کە عاتیفەی زاڵ ئەبێ بەسەر هۆشیا، ئەیەوێ دلبەر هەموو جڵەوێك بۆ ئەم عاتیفە هەڵچووە شۆڕ بکا، جا لێرەدا ئەگەر ئەو دولبەرە عاتیفەی ببێ، لە زۆر کاتا ئەم دوو عاتیفەیە یەك ناگرنەوە، چونکە بزووتنەوەیەکی وورد لە یەکێکیانا بۆی هەیە ئەویتریان سارد بکاتەوە، ئەگەر عاتیفەشی نەبێ، مانای ئەوەیە کە ئەو دلبەرە خۆ فرۆشە، لەشی خۆی پێشکەش بەهەموو کەسێك ئەکا.

شاعیرەکانی ڕۆژئاوا لەم دوو زاهیرە وجدانیە دواون،یەکەمیان لەلای گۆتی، 1749م-1832م،شبیللەر، 1759-1805م وەلامارتین 1790م-1869م، دووەمیان بودلێر1821م-1867م. بەڵام هەردی لەسی مەقتەعی یەکەمی شیعرەکەیا، باسی دڵدارییەکی پاکی لەدەس چوو ئەکا، لەیەکەم جارا خوێندەوار وا خەیاڵ ئەکا کە خۆشەویستەکەی مردووە، یاخود دلبەر بەپێچەوانەی عاتیفە تایبەتیەکەی خۆی شاعیری لەو لا داناوە چونکە، هۆشی جڵەوی بۆ ئەم عاتیفەیە شۆڕ نەکردووە، بەڵام لەمەقتەعی دوایی‌دا، شاعیر بیرو خەیاڵمان ئەبا بۆ دنیاییێکی تر، ئەو خۆشەویستەجوان‌و پاکە، ئەبێ بە خۆشەوستێکی جوانی پیس، کەئەڵێ:

وونی کا با لەبەر چاوم نیگاری چاوی فێڵاویت
گوڵی‌بێ بۆنی جوانیتو بزەی سەر لێوی ژەهراویت

لەشیعری ڕازی تەنیایی یا، دیارە کە شاعیر بەتەجروبەییێکی شعوری‌ی درێژدا ڕۆیشتووە لەرووی عاتیفەوە، وە لەگەلێك پلەی ئەو تەجرەبەیەدا، ئەگەر نەڵێم لە هەموویا، هەستی بەتاڵی‌و ناخۆشی‌سەرنەکەوتن (اخفاق) کردووە کە بۆتە سەر چاوەی نائومێدی لەژیانی شاعیردا، هەر وەکو لەم پارچەیەدا سووچێکی ئەم راستەقینەیەمان پیشان ئەدا.

هەرچەندە لەسەرەتای شیعرەکەیدا ئۆباڵی ئەو نائومێدی‌یە ئەخاتە ئەستۆی کوێرەوەری‌و ئەرکی ژیانی تایبەتی خۆی:

ژیان‌و ئەرکی ناخۆشی، پەپوولەی ئارەزووی کوشتم
شەرابی جامی دڵداری، لەتافی لاوی‌یدا، رشتم.

کەواتە تەنیایی‌و دەنگنەدانەوەی سۆزی دەروونی لەدڵی جوانێکا بوونەتە مایەی خەم‌و بێزاری بۆ شاعیر:

لە (تەنیایی) شەوی ژینا، ئەنێم هەنگاوی کوێرانە
نیە دەستێ دەرم بینێ لەناو ئەم گۆڕە وێرانە

واتە دەستی نازەنینێك، دڵی نەرمی‌شۆخێك، پڕشنگی چاوێکی مەست ئەیتووانی شاعیر رزگار کات لەو مەینەتی‌یەی تیایا ئەژی، نەك ئەوەندەی تر بگەشێتەوەو پێشی خات، وە ئەو گێتی‌یەی کە ئێستا بەشەوێکی تاریك، یان گۆڕێکی وێران دێتە بەرچاوی، بۆی بکات بە ژورێکی رووناك.

نیە تەنیا پەری زادێ، کەپاڵم پێوەنێ نازی
کە بەهرەی سیس‌و ژاکاوم ببوژێنێتەوە ڕازی

((هەردی)) وەکو لەتوێ‌ی شیعرەکانیا بۆمان دەر دەکەوێت خاوەن هەستێکی ئینسانی‌ی قووڵ‌وعاتیفەییێکی لەجۆشی لاوی‌یە، بەڵام بێ بەشی‌ی لەدۆستایەتی‌ی شۆخێك کە بتوانێ هاوبەشی ئەو هەستە جوان‌و عاتیفە گەرمەی‌بکات،وەڵامی ئەو پرسیارەمان ئەداتەوە:

بۆچی شیعرەکانی ((هەردی)) هەمیشە شێوەی یەئس‌و دڵتەنگی‌و خەم‌و بێزاری‌ی بەسەرەوەیە؟.

هەردی ئەڵێ:

فاتیمە دووچاوی مەستت پڕ تەلیسمی جوانی‌یە
پڕ شەرابی خۆشەویستی‌و ئارەقی یەزدانی‌یە
بەژن‌و باڵاکەت نموونەی هەیکەلی یۆنانی‌یە
لارو لەنجەت موسیقایە بەستەیە گۆرانی‌یە





لەو مەقتەعەدا وەسفێکیمسالی نایابی چاوەکانو لەشو لاری ست فاتیمەی کردووە، وە تارادەییێکی زۆر لەو وەسفەدا سەرکەوتووە، بەڵام لەڕاستیدا مەبەستی شاعیر گەلێك لەپلەی وەسفەکە بەرزترە، بەتایبەتیکەئەڵێ:

گەرچی دڵداری لەخاکی ئێمەدا ئەفسانەیە

هەر بەتەنیا بۆ کوڕی خاوەن تەلارو ئانەیە

وێنەییێکی تاڵو ناخۆشمان پیشان ئەدا لەدڵداریی وولاتی ئێمەدا.

بەڵێ ئەگەر (ست فاتمە)ییێك پەیمانی دڵداری لەگەڵ یەکێك ببەستێ، ئەگەر ئەو (ست فاتیمە)یە دەوڵەمەند بوو، هاوار بەماڵی ئەو کەسە، چونکە لەکن ئێمە (دینار) لە (دڵداری) مەبەست ترە، هەر وەکو هەردی بۆمانی باس کردووە، بەڵام ئەم هەموو شتەش نابێتە هۆی ئەوەی کە عاتیفەی دڵدار بەرامبەر دلبەرەکەی سارد ببێتەوە..

هیچ گومانم نیە، کە ئەم هەڵبەستەی هەردی بووە بە مارسیلیزێکی غەرامی کوردی لەناو گەنجانی کورد، بەکورو کچەوە، بەتایبەتی لە ناو گەنجە خوێندەوارەکانی سلێمانیو هەولێر، ئەمەش لام وایە لەبەر ئەوەیە کەشیعرەکە چەشنە مۆسیقاییێکی گۆرانی تایبەتی خۆشی هەیە، وە وەسفێکی گەلێك حسییە، وە شاعیر باسی واقعێکی دڵداری وولاتەکەمانی کردووە، هەروەها وشەی ((ست فاتیمە))ش خەیاڵی خوێندەوار ئەبا بۆ لای کچێکی نەشمیلی خوێندەوار– لێرەدا مەبەسم لەخوێندەوارێکی زل نیە، چونکە ئەگەر خوێندەوارێکی گەورە بێ ئەبێ پێی بووترێ پوورە فاتی– کە تازە لە دار المعلمات دەرچووە، وە فێری هەندێ مەدنیەت بووە لە بەغدا.

لێرەدا وەکو لەسەرەوە ووتم، ئەم شیعرە گۆرانی هەمیشەی لاوەکان نیەو بەس، بەڵکو هی شۆخەکانیشە، چونکە عاتیفەی ئەوانیش بۆی هەیە لەناو ئەم وەسفە جوانەیجنسەکەی خۆیان بتوێتەوە... هەر کچێك حەز ئەکا ست فاتیمە خۆی بێ، یاخود ئەگەر ویستی مەتحێکی دەستە خوشکەکەی بکا، پێی ئەڵێ:

تۆ ست فاتیمەی، ئەگەر خۆشیشی بوێ، پێی ئەڵێ: گیانەکەم ست فاتیمە!.

دیوانی ڕازی تەنیایی خونچەییێکەلەباخچەی فراوانی ئەدەبی کوردیدا، نالێین گوڵێك، وە لەو باوەڕەداین ئەوەی بۆنێکی ئەم خونچەیە بە بەر لووتیا تێپەڕبێت هەر گیز دڵی لەخۆی دانامێنێ، وەقسەی پڕوپووچی ئەمو ئەوی ناچێ بەگوێدا کە باخچەی ئەدەبمان ووشكو بێ بۆنە، بەڵکو بەرهەمو بۆنی گەیشتۆتە رادەییێك ئەگەر بێتو وەك ئەدەبی وولاتانی تر بەدەستی دڵسۆزی خۆمان ئاوی بدەین، وە پەروەردەی بکەین هێندەی پێ ناچێ شان ئەدا لەشان ئەدەبیبەرزی هەرە وولاتە پێشکەوتووەکان.

سلاو بۆ کوردستان،

بۆئەو خاکە پیرۆزەی گوڵاڵە سوورەکەی، ئەم دەشتە، خوێناوی جگەرتانە..

15ی کانوونی یەکەمی 1957م





12




## ئەی دیدە پەری!

ئەی دیدە پەری! بەو دەمە ، بەو کوڵمە گوڵینە
بۆ کەس نیە تا سەر ، ئەوەرێ ئەم گوڵی ژینە
تاسەر نیە ئەم نازە ، وەها دووری مەبینە
ئەو چاوە گەلاوێژە خەڵاتی کە برینە
ئەو زوڵفە کە ئێستاکە دوو توێی عەنبەری چینە
ڕۆژێکی کە دێ تێکەڵی توێی خاکی زەمینە
ئەو گەردنە بێگەردە، کە وەك تەختی بلوورە
ئەو لێوە کە وەك خونچە تەڕو ناسكو سوورە
ئێستاکە بەبێ ڕەحمی سزای جەورو فتوورە
لای وایە کەژین فانی نیەو ڕێگەیی دوورە
نایزانێ کە هەر پەنجەیە لەم خاکی زەمینە
کوڵمی دە هەزار (لەیل)و دەمی سەد (مەمو زین)ە
ئەمڕۆ دڵی بێچارە ئەبەی ئەی خەیە ناوداو
نایزانی سبەینێ ئەکەوی سەر کزو داماو
ئەو جوانی‌یە ئەڕوات‌و لەچاو گوم ئەبێ وەك ئاو
ئەو ڕۆژە ئەبێ دائیمە هەر بێنیەوە بەرچاو
تا ڕەحمێ بکەی ئێستەکە بەم زامو برینە
سەرکز نەبی لەو: جێگە بێ سامانی زەمینە
ئەم چەند قسەیەم ووتووە بەتۆ ئەمڕۆ بە چاکی
گەرچی ئەشیزانم دڵی بەردت نیە باکی
مەڕوانەرە ئەمڕۆکە بەڕومەت گوڵی تاکی
بڕوانە سبەینێ کە لەناو دامەنی خاکی
سەد (لەیل)ی وەکو تۆ بووە لەم ڕۆشنی ژینە
ئێستاکە لەناو جەرگەیی تاریکی زەمینە...

سلێمانی
1939



## (شۆڕشی نائومێدی)

بناغەو چینی دیواری
تەلاری بەرزی دڵداری
بەسەر لانەی دڵا ڕووخا تەپو تۆزی خەمی هێنا
بەدووی باڵداری ئاواتی فریوی بێ سەرو شوێنا
دەسا ئەی پاییزی ماتەم ئەوەندەم تاسە پێماوە..
هەموو ئەو یادگارەی لەو ژیانی عەشقە جێ ماوە
بەجارێ وەك گەڵا سروەی خەزانت گشتی ڕامالێ
بەووردی هەر گەڵایێکی ببا بۆ قوژبن‌و چاڵێ

***

دەبا، (با) ڕەش لەدوایی‌دا
لەبیابانی .. لماویدا
تەپو تۆزێکی وابێنێ هەوا یەك جار بخرۆشێنێ
سەری ئەو قوژبن‌و چاڵە وەکو گۆڕیچە داپۆشێ
لەپاشانا بەبای وەشتا لەسەردا هەوری ڕەش بێنێ
بەگۆڕی یادگارا، با بەخوڕ تاوێ.. بباریێنێ
دەبا بمرێ بەیەك جاری لەگۆڕی تەنگ‌و تەنیادا
نیشانەو ناوی هەڵگیرێ لەناو بازاڕی دنیادا
بەڵێ، با گەردەلوولێ بێ
ئەوی بۆنێکی تۆی لێ بێ
وەکو ئەو پووشە ڕاپێچی بکا بۆ: گۆڕی تەنیایی
بەگوێیا بابچرپێنێ نقامی عومری کۆتایی
پەپو هامرازی وێرانەو نیشانەی مەرگی ڕوناکی
بەدەنگی شوومی باشیوەن بکا بۆ گیانی ناپاکی
لەسەر ئەو دەنگ‌و ئاوازە دەبا شەیتانی ڕاڕایی
سەمای پڕ تەوسی بێ شەرمی بکا بۆ عەشقی کۆتایی..!

***

دەبا دەشتی ستەمکاری
ژیانی پڕ لەزۆرداری
لە یادا بیسڕێ شێوەت لەیادی ژین‌و گەردوونا
بەبێ ڕەحمانە غەرقی کا لەبەحری قووڵی وون بوونا
وونی کا با لەبەر چاوم نیگاری چاوی فێڵاویت
گوڵی بێ بۆنی جوانیت‌و بزەی سەر لێوی ژەهراویت
بەتاپۆی یادگاری تێك شکاوی بێ سەرو پێوە
بەدڵداری عومر کورت‌و.. شەوانی جوانەمەرگێوە

سلێمانی 1944



# "دڵێکی تێکشکاو"

به سەرسامی لەسەر لوتکەی بڵندی گەنجی وەستاوم!
شریتی عومری ڕابوردووم وەکو خەو دێتە بەر چاوم

شریتی چی؟ سەراپا سەر گوروشتەی نا ئومێدیمە
فلیمی پڕ لە ناسۆری هەرەس هێنانی لاویمە

تروسکەی تیا بەدی ناکەم، سەرنجم چەندە لێداوە.
لە تاپۆی نامرادیم و تەمی ناسۆری بەولاوە..!

ئەوی ئەوساکە ڕوناکی ئەدا بەم ژینە شێواوە
دڵێکی پڕ لە ئاهەنگ بوو، کە ئێستا پاکی ڕوخاوە..!

* * *

بەڵێ ئەوسا دڵێکم بوو،کە سەرچاوەی ژیانم بوو
دڵێ: مەڵبەندی ئاوات و تەوژم و تینی گیانم بوو

دڵێ: گوڵزاری دڵداری و بەهەشتی خۆشەویستی بوو
وەکو بتخاتە مەیدانی بتی جوانی پەرستی بوو

لەگەڵ هاوارو گریانی هەژارانا لە شینا بوو
لەگەڵ ناڵەی کەساسانا لە خورپەو ڕاچەنینا بوو

لەژێر سایەی ئەوینێکا، هەموو سیحرێکی پۆشی بوو
لە کونجێکی خەراباتا، خەریکی بادە نۆشی بوو

دڵێ بوو: دارو دیواری هەموو مەستی نیگارێ بوو
هەموو سوچێکی دەسکردی، بەڵێنی تاقە یارێ بوو

دڵێ، خونچەی تەمای وا بوو، لە خۆشی ئەو دەمی واکا،
کە تیشکی ئەو لە لێوی‌دا، گوڵاو پرژێنی دنیاکا..!

دڵێ، ئامادە بوو، تاری، هەزار ئاوازی لێ هەستێ
بە مەرجێ: گوڵبەدەم جارێ بە مەستی لێی بدا، دەستێ!

تەلاری دڵ، کە دیواری وەها مەستی ئەوینی بوو:
لە باوەش گرتنی باڵای، هەموو ئاواتی ژینی بوو..!

گوڵ و گوڵزاری دڵ وابوو: خەیاڵی ڕۆژو هی شەویان:
(کەوا پرشنگی دوو چاوت، بڕێژێ چاوی بێ خەویان!)

وەنەوشەو نێرگزو شەوبۆ، هەموو سەرخۆشی تاسەی بوون
لەتەك سروەی بەیانیدا: تەمادارى هەناسەی بوون.!

هەناسەی ئەو، کەبێ، ڕایانژەنێت و ماچی کا، ڕوویان
کە دابیبێنێ، لە جێی سروەی بەیانی، زوڵف و گێسوویان..!

هەموو پێکێکی مەینۆشی، بەیادی ئەو، کە پڕمەی بوو
لە مەیخانەی دڵا کەیلی: بزەی ئەو جووتە لێوەی بوو!

هەموو پاڕانەوەی وابوو، بە شێوان و سبەینانێ:
کە ڕۆژێ لێوی پڕ تاسەی، لە سەردوو لێوی ئەو دانێ!

* * *

کەچی ئەو کۆشکی چەند ساڵەی، دڵم بنچینەکەی دانا
بە تەنیا گەردەلولێکی (نەهاتی)، چوو بە ئاسمانا..!

هەموو ئەو نیازو ئاواتەی، لەناو ناخی دەروونا بوو
لە داخی بێبەڵێنی ئەو، بە جارێ تەفرو توونا بوو..!

بەڵێ، کاتێ بە خۆم زانی، بەهاری پڕ ئەوین ڕۆیی
خەوو ئاواتی چەند ساڵەو بەڵێنی پێگەیین ڕۆیی..!

گەلێکم پشکنی دنیا، لە دووی ئەو جووتە لێوەی ئەو،
هەزار ئەفسوس! نە ئەو ڕۆژەم بەدی کردو نەشێوەی ئەو..،

نە پرشنگی لە خونچەی‌دا، نە پەنجەی‌دا، لە تاری دڵ..،
نە بەژنی شۆخ و شەنگی بوو: بە میوانی تەلاری دڵ..!



نە چاوانی گوڵی ڕشت و نە کلچێوکێکی پیاهێنا..!
نە پرچی نێرگزی مەست و، وەنەوشەی شینی داهێنا..!

نە پێکی نایە سەر لێوو، نە بیستم ڕازی شیرینی...
نە ماڵ ئاوایی لێ کردم، نە ئیتر شێوەییم بینی..!

* * *

بەڵێ ئەو خونچەیەی چەند هەنگ پەشۆکا بوون لەژێر پێیدا
خەوی ڕۆژو شەوی وابوو: گزنگی چاوی تۆ لێیدا..!

کە چاوی تۆی نەدی شێوا، لە داخا کوڵمی خوا کردی
گـــــــەڵاکانی وەکو عومری منی بێچارە با بردی..!

تەلی دڵ، چەندە سەیری کرد، کە پەنجەی تۆی نەدی چاوی
دەروونی بوو: بە گۆڕیچەی هەموو ئاوازی تاساوی..!

تەلاری دڵ کە ڕۆشن بوو، بەوەی تۆبی بە میوانی..
هەواری چۆڵ و هۆڵی بوو: بە گۆڕی گردی سەیوانی..!

* * *

گوڵی باخی دڵم، چاوی، بە دوی تۆدا ئەوەند گێڕا..
هەتاکو چاوەکەی خۆشی، لە دەوری چاوی تۆ گێڕا..!

وەنەوشەو دەستە خوشکانی، لەبێ مەیلی هەناسەی تۆ
هەناسەی دەرنەچوو دەمیان‌و تاساشن، لە تاسەی تۆ..!

وە یا ئەو پێکە ڕەنگینەی کە هەر نەیبیست لە تۆ دەنگێ
لە داخا بادەکەی ڕشت و، سەری خۆی دایە بەر سەنگێ...!

لە پاشا گەردو تۆزقاڵی، کە وەك کەرتی دڵی من بوو
یەکی ڕوی کردە سوچێك و لەتاریکی شەوا وون بوو

بەڵێ، ئێستا ئەوی جێ ماوە بۆ من، یادگارێکە
بەسەرهاتی دڵی وردو بەسەرچوونی بەهارێکە.

* * * *

*(لە ساڵی 1946دا ووتراوەو لە نیسانی 1983دا تەواو کراوە)





1953

## شانزە ساڵ

## چاوەڕوانی

دوێنێ لەتەك نەمانی سوورایی خۆرنشینا
کە شەو هێواشی باڵی کێشا بەسەر زەمینا
تۆماری شانزە ساڵی ژیانی خۆشەویستیم
ئاواتی پڕ لە تاسەی دەروون و گیانی برسیم
بەجارێ نایە چاڵی ژیانی پڕ سزاوە
کە شەوقی چەندە گەنجی هەژاری تیاڕزاوە
لەتەك هەموو عەزاب و ژیانی بێ هیوادا
ئەم ڕەنجی ساڵەهایەم کە گشتی چوو بەبادا
لەتەك ئەمانەشا من هەر چەندە تێ گەییشتووم
کە دوی خەیاڵی دووری پەری نیگارێ کەو تووم
لەکانی قووڵی دڵما کە بۆتە گوڕی ئاوات
ڕژاوە نەقشی باڵای بڵندی ئاڵ و واڵات

عەبابەیلێ 1948



## ئۆباڵی خۆت بەئەستۆی خۆت

بەدەستی خۆت کەجامت خستە سەرلێوت، غەشیمانە
ئەگەر زەهریشی تێدا بوو، گوناهی خۆتە بیزانە
هەڵە ، یاخود گوناهت کرد لە کاتێکا کە بێ هۆشی
سزاو تاڵاوی هەرچی بی ئەبێ وەك بادە بینۆشی
ئەگەر پیاویت و ئەیزانی کەوا ئۆباڵی کردارت
لە ئەستۆی ووردی خۆتایە ، ئیتر بێ سوودە هاوارت..

## پێنج خشتەکی
## لەسەر غەزەلێکی ((شێخ نووری))

قەت نەدەی ئازاری گیانی مەست و بێدارانی شەو
خۆت نەخەیتە بەرشەپۆلی ئەشکی بێ پایانی شەو
ئەی کچی خواوەندی جوانی و ئەی چرای دیوانی شەو
((خۆت بپارێزە لەئاهی دڵ بریندارانی شەو
نەك خواناکەردە گیرابێ دۆعای ناڵانی شەو))
ویڵ و تاریکە دەورم فەرشی ڕێگەم مەینەتە
بێ کەسم تەنها ئەناڵم مەرگێ خۆمم عەزرەتە
سازی ئاهەنگی شەوانم سۆزی جەرگی لەت لەتە
((یاوەرو یاری ئەنیسم ئاهو ئەشکی حەسرەتە
ئافەرین ئەی بارك الله دیدەیی گریانی شەو))
وا نەزانی دەستی غەم یادت لەدڵدا دەرئەکا
ئەشکی خوێنینم دەلیلە بۆ کەسێ باوەڕ نەکا
گیانەکەم بەو تیشکی چاوەی شەڕ لەگەڵ ئەختەر ئەکا
((دڵ ئەبێتە قەترەیێ خوێن و لەدیدەم سەر ئەکا
هەر کە ڕابووری بەدڵما سوحبەتی جارانی شەو))
هاودەمێ فەرمووی لەبەر چی کردەوەت گریانە هەر
تافی لاوێتیتە، لاوی قەڵبەزەی سەیرانە هەر
من ووتم سەیران و خۆشی پێشکەشی شادانە هەر
((ئەشکی حەسرەت لازمی جەمعی سیا بەختانە هەر
شەونمی سوبحە دەلیلی قەترەیەك گریانی شەو))
هەولی زۆرم دا لەداوی زوڵفی ئەو بێ مروەتە
دەرچم و دوایی بهێنم بەم عەزاب و مەینەتە
پێی وتم بێسوودە هەوڵت تاکو ماوی جێگەتە
(("نوری " لەم پێچ و خەمی زوڵفە نەجاتت زەحمەتە
لای سەخی تەبعان مەحاڵە ڕوخسەتی میوانی شەو))

هەڵەبجە 1948

## من و تۆ

چە سرێکت لەناو دڵدا حەشار داوە بەپەنهانی
کە چاوت چەشنی ئاوێنە ، وەها بێ پەردە درکانی
ئەزانم دڵ هەیە ، وەك مس کە ژەنگ دێنێ بە ئاسانی
دڵی تۆ زێڕی تێزابە لە کوێوە ژەنگی هەڵهانی
ئەمانە گەرچی تێ ناگەی بەڵام پێویستە بیزانی
هەتا ماوم لە دنیادا ، فریشتەی باخی ئاواتم
بەدڵ هەر چەشنی خەرمانە لە دەوری مانگی گۆناتم

1953





## چەپکە گوڵێك بۆ ((ست فاتمە))

ئەمەوێ خوێندەواری خۆشەویست ئەوە بزانێ، کە ناوی (فاتیمە) وە نەبی ناوێکی ڕاستەقینە بێت، بەڵکو وەکو لەگەڵ چیرۆکدا ناوی خواستەمەنی بۆ قارەمانی چیرۆکەکە دائەنرێ ئەمیش شتێکە وا ئەمە لەو لاوە بوەستێ، لە لایەکی تریشەوە (ست) هەر تەنیا لە بەر ئەوە ووتراوە کە سەرنجی خەڵقی ڕابکێشێ و هیچی تر..))

(أ.ه)

فاتیمە ! دوو چاوی مەستت پڕ تەلیسمی جوانی یە
پڕ شەرابی خۆشەویستی و ئارەقی یەزدانی یە
بەژن و باڵاکەت نموونەی هەیکەلی یونانی یە
لارو لەنجەت موسیقایە بەستەیە گۆرانی یە
بووکی ڕازاوەی خەیاڵم گیانەکەم ست فاتیمە !
تاقە پرشنگێکی چاوت ئەو پەری ئاواتمە
گەرچی دڵداری لە خاکی ئێمەدا ئەفسانەیە
هەر بەتەنها بۆ کوری خاوەن تەلارو ئانەیە
گیانەکەم ! ئەمما دڵی من لەو دڵە شێتانەیە
بێ ئەوەی هیچ شك بەرێ کوژراوی ئەو چاوانەیە
هەر بەتەنیا خۆشەویستی شك ئەبەم ست فاتیمە!
سەروەتم ناوێ بەزەی تۆ ئەوپەری ئاواتمە
خۆشەویستی وا کە نامەی خوایە بۆ پێغەمبەران
بەرزو ناسك، وەك هەناسەی پڕ گوڵاوی دلبەران
ئەو کەسانەی بۆ قرانێ چەندە دڵیان هەڵوەران
خەلقی تر پارە پەرستی بابکەن ست فاتیمە !
من بەتەنها تۆ پەرستی ئەوپەری ئاواتمە
زۆر کەرەت هانم ئەدا داخی دەروونی پڕ گڕم
بۆتی هەڵڕێژم سکاڵای ناسکی گەرم و گوڕم
داخەکەم کاتێ کە دێمە بەردەمت واقی ووڕم
وام ئەشێوێنێ بەجۆرێ نایەڵێ هیچ دەربڕم
بووکی ڕازاوەی خەیاڵم گیانەکەم ست فاتیمە !
گوێیە بۆ ئەم ڕازە شل کەی و ئەو پەری ئاواتمە

سلێمانی 1950

## (چاوەڕوانی بێ هوودە)

هەموو ڕۆژێ لەبەر سەیری بتی ئەو بەژن و باڵایە
لەسەر ڕێیدا ئەوەستم من هەتاکو ئاوی پێم دایە
بەدوو چاوێ کە شەوقی چاوەڕوانی ئەی تروکێنێ
بەدوو چاوێ کە سڕی قوڵی لاوێتی ئەدرکێنێ
سەرنجی ڕێ ئەدەم ، ڕێگا هەموو شێوەی ئەوی تیایە
وەکو دنیا لەناو جوانی ئەوا توابێتەوە، وایە
شنەی با، باسی جوانی ئەو بەگوێی من دا ئەچرپێنێ
هەموو دەرکەوتنی شۆخێ دڵی من دائەخورپێنی
بەڵام خورپەی تەواوی دڵ لەگەڵ هەنگاوی ئەودایە
کە سەرتاپا لە ئاوازی بەهەشتی خواوە پەیدایە
بەڵێ کاتێ کەئەو دەرکەوت ئیتر من بێسەرو شوێنم
بەتیشکی خۆری جوانی ئەو بەجاری قوڵپ ئەدا خوێنم
وەکو چۆن نەونەمامێ گەردەلوول ئەیبات و ئەیهێنی
لەشم مووچڕکی دڵداری وەها ناخی ئەبزوێنێ
ئەگەرچی وەك خەیاڵی من عەبا دەوری لەشی داوە
لەئەندام و لەش و لاری بڵندو ڕێکی ئالاوە..
بەڵام کاتێ کە با، چمکی عەباکەی لا ئەدا تاوێ
ئەڕێژێ[1] پووزی نایابی لەسیحری خوایی لافاوێ

سلێمانی 1951

هەرچەندە ئەم هەڵبەستەش، وەکو زۆربەی هەڵبەستی تری من ناتەواوە بەڵام ئەوەندەی کە توانیومە دەری برم، لام وایە تینوێتی گەلێك کەس ئەشکێنێ.

(أ.ه)







# دوو چەشن دڵداری

ئەم دڵەی وەك بت پەرستێ ڕوو ئەكاتە چاوەكەت
نوێژ ئەكا بۆ :تیشكی چاوو زوڵفە تێك ئاڵاوەكەت
گەرچی ئەیشێلی بە زەبری قۆندەرەو پێڵاوەكەت
قەت بە دڵڕەق باست ناكەم، نایزڕێنم: ناوەكەت
چونكە ئەیزانم تەلاری یارە خوا پێداوەكەت
مەستی كردووی، بۆیە نابینێ لە عاستم، چاوەكەت

⋆ ⋆ ⋆

باخەوان بۆ ئەو مەبەستە گوڵ ئەلاوێنێتەوە
بۆ ئەوەی گەورەی بكاو بۆ پارە بیگۆڕێتەوە
بیفرۆشێ بەو كەسەی خەڵقی ئەڕوتێنێتەوە
بۆ ئەوەی مێزی شەرابی، پێ بڕازێنێتەوە..
كچ لەلای ئێمەش گوڵێكە، بۆیە پەروەردەی ئەكەن
تا بڕازێنێتەوە: مێزی شەرابی دەوڵەمەن..!

⋆ ⋆ ⋆

ڕەنگە لات وابێ كە گوایا: یارەكەت مارەت ئەكا
یا بە كەیبانووی تەلاری بەرزی ئەم شارەت ئەكا
ئەم خەیاڵەت خاوە، تووشی: داوی ئەو مارەت ئەكا
چونكە وەك گورگێكە مەیلی ئەو لەش و لارەت ئەكا
ئەو بەتەنیا بۆ گوڵی سەرمێزی بادەی تۆی ئەوێ
هەر كە جارێ بۆنی كردی، جا گوڵێكی نوێی ئەوێ!

⋆ ⋆ ⋆

ئەو، گوڵی بۆ: مێزی بادەو پۆكەرو یاری ئەوێ
واتە: تۆی بۆ تێپەڕینی كاتی بێزاری ئەوێ
من، گوڵم بۆ: تۆوی باخی. ژین و دڵداری ئەوێ
یانی من: تۆم بۆ: ئەوینی عومری یەكجاری ئەوێ
تۆم ئەوێ وەك گوڵ لە باخی ماڵی مندا هەڵبدەی
نەك گوڵی سەرمێزی ئیمڕۆ بیت و پێخوستی سبەی!

⋆ ⋆ ⋆

من، ئەوینم هینی عومرەو، هی خەوی شەوگار نی‌یە
وەك خەوی خاوەن تەلارو خاوەنی دینار نی‌یە
هەربوەو هەرگیز ئەمێنێ، هینی جارو بار نی‌یە
ئاوی لێڵی كوێرە شیوێ، چەشنی هی ڕوبار نی‌یە
جا ئیتر من وا قسەی خۆم پێگەیاندی، بێ درۆ
حەز ئەكەی هەروەك پەپوولە ڕوو لە ئاگركەو بڕۆ!

لە ساڵی 1950 دا ووتراوە ولە ساڵی 1983 دا تەواو كراوە

(دوو چەشن دڵداری هەیە )

ئەو شیعرە لە چاپی یەكەمدا ناوی (دڵداری كچی تازە)یە، ئەگەرچی لە بنەڕەتدا ناوی (دوو چەشن دڵداری) بوو.



# تەپڵی بەتاڵ

(وەمزانی: کە ناموس و حەیا نرخی کوڕانە
ڕاستگۆیی وولات پەروەری، ئەنجامی ژیانە
نەمزانی براکەم، هەموو ئەم ناوە زلانە
وەك تەپڵی بەتاڵ، گەرچی زل و گەورەیە، دەنگیان
دەسکردی خەیاڵن، لە ژیانا: نییە ڕەنگیان!)
* * *

(نەمزانی ئەتیکێتی سەدەی تازە، ڕیایە!
ئادابی لەلایە ئەوی وەك لۆتی وەهایە
فیزی ئەم و ئەو هەڵئەپەڕێنێ بە سەنایە
کێ باوی هەبوو، نۆکەرە ئەو، گوێ ئەلەقێنێ
مەیمونە، تەشی ڕێسە، بە دڵ پیاهەڵئەخوێنێ!)
* * *

بەم جۆرە ئەڕۆیشت و لەبەرخۆیەوە ئەیووت:
بڕواکە نەکەیت: یاکە نەبی ئێستەکە دەمکوت
فەرمو ئەوە گەل: چۆنی ئەڵێم، وایە کوت و مت
گەورەی کە لەبەر پارە تەشی ڕستنە پیشەی
بچکۆلەکەشی نۆکەری، کاری هەمیشەی!)
* * *

(چەند ساڵە، لە ڕێی ئەم گەلەدا، من کە ئەسووتێم
کەس نرخی نەزانیم و هەتا تێنەگەیی لێم..!
سا شەرتە کە میللەت ئەمەبێ، بیخەمە ژێر پێم..
هەرچەندە بە سەرزاری ئەبێ: گەل مەبەسم بێ
بۆ شوێنەوونی، بەرزیی ئەو: گورزی دەسم بێ!)
* * *

ئاوا بە ڕق و کینەوە هەنگاوی ئەنا بۆی
پیلانی ئەکێشا بە خەیاڵ و خەوی بێ شۆی
تاگەییە تەلارێك و کەمێ هاتەوە سەر خۆی
وەك دوو دڵی یەك، قاچی ببەستێتەوە تاوێ
وەستاو، لە پاشا، چووە ژوورێ بە شەقاوێ
* * *

لەو ڕۆژەوە هەرچی کە ئەزانی و نەئەزانی
لەو کۆشکە هەڵی ڕشت و فرۆشتی بە نیهانی
کۆتایی بە ژینی لەوەپێشی، بەوەهانی!
لەوساوە قەڵەمبازی ئەدا: پایە بە پایە!
بۆ هەڵمەتە کاسەی گەلەکەی، بوو بووەسایە
* * *

ئینجا کەگەیی ئەو بەپلەو پایەیی ئەمڕۆی
کۆبوونەوە لێی: پایە پەرستانی وەکو خۆی
تـــاکو بەتەشی ڕستن و بادانی درۆ بۆی
سەودا لە پەنایا بکەن و (جێ) بفرۆشن
پاروو بـــــگلێنن بە شەوو بادە بنۆشن
* * *

شـــــــەو مێزی شەرابی کە ئەڕازایەوە بۆ کۆڕ
ڕووناکی ئەبەخشی لە شەوا، ویسکیی سەر مۆڕ
جا پێك و سەری گەرم و قسەو بابەتی سەد جۆر
هەر پەخشی ستاییش بوو بەسەر کاکی بەڕێزا!
هەر گوڵ ئەکرا، جا، بەیەخەی خاوەنی مێزا!
* * *

تەنیا کە ئەبوو، یاخەفەتێ کاری ئەکردتێ
ئەیدی کە قسەی هاودەمەکەی دێتەوە بەر گوێی
بەم شێوەیە: ئەیخوێندەوە، ئەو نامەیە بۆ خۆی:
(فەرموتە: ئەوەی خزمەتی ژێر دەستی مەبەست بێ
پێویستە وەکو ئێوە: مەزن بێت و بەدەست بێ..!)

* * *

(پاکانە ئەکەیت بۆ: هەوەسی نەوسن و برسیت؟!
گوایا کە لەبەر خزمەتی گەل، عاشقی کورسیت؟
کورسیت کە هەبێ، دادی گەلی لێوە ئەپرســـیت؟
قوربان! بەچ ڕەنگ پێت ئەکرێ: خزمەتی کـونجێ
تا سودی لەگەڵ سودی سەری گەورە، نەگونجێ؟)
* * *

(خۆ گەر بیەوێ ئەو سەرە، پیلانێ بتاشێ)
یا بۆ گەلەکەت، سازی بکا: کورەوو ئاشێ
ئەیبینی کە لەم دامەیەدا، ئەتکەنە: داشێ!
ئەوسا مەزنیت، دەرئەکەوێ، خەون و خەیاڵە
ئەو گەورەیی‌یەی ئێوە وەکو: تەپڵی پەتاڵە!)
* * *

هەرچی ووتبوو هاودەمەکەی، گشتی وەهابوو
پیلان‌و گەل‌و ڕۆڵەیی گەل، ئاگـــــــرو کابوو
بۆ سودی کەسانێ، ملی چەند ڕۆڵە شکابوو!
لەم نەقشەیەدا، کاکی مەزن، پیادەیی شابوو
لافی مەزنی‌و گەورەیی ئەو، هەروەکو بابوو!
* * *

ئـــــــەوسا قسەکەی هاتەوە گوێ زۆر بەزوڵاڵی
( تۆ دەنگی دەهۆڵێکی، وەیا : تەپڵی بەتاڵی..!)

ئەم شیعرە کە لە ساڵی 1951دا ووتراوە، بەسەرهاتی کابرایەکی ڕوخاوە کە لە سەردەمی (پاشایەتیدا) ڕووئەکاتە کۆشکێك و لەوێ: ڕوخاننی خۆی مۆر ئەکات و دوای ئەوە بەرزی ئەکەنەوە و ئەبێت بە خاوەن پایەیەکی بەرز...



# (پەیامی یار)

لە یارەوە :
لە شۆخ و شەنگی پارەوە،
لە ڕازی.. پڕنیهانییا،
لە تەك شنەی بەیانییا،
پەیام لە یاری جوانەوە
گەیشتە لام...

* * *

بەرامەکەی
گوڵاوی باخی نامەکەی،
کە ئاوی زیندەگانییە...،
شەرابی کامەرانییە...،
گوڵی هیوای ژیانەوە...،
گوڵی هیوام...

* * *

چ نامەیێ؟
چ پەنجەیێ چ خامەیێ؟
ئەوەندە دڵ ئەکاتەوە؟!
خەفەت لەبیر ئەباتەوە،
ئەخاتە ناخی گیانەوە:
تەزوی بەتام...؟!

سلێمانی /1958





# (تانگۆی کوردی)

تاقانە خونچەی باخی ژیانم..
زیندو کەرەوەی ئاواتی بێ گیانم!
ڕۆشنکەری : ڕێگای ژین و مانم
بالەدەستی ، ژینی پەستی شارو دێ، شارو دێ
ڕاکەین و ڕووبکەینە : چۆڵ هەردێ، ناو هەردێ
تەنیا وەك ئاسکۆڵەی کۆسار
ڕوبکەینە قەد شاخ و ناو گوڵزار

لەقەد پاڵی شاخی هەزار بەهەزار
لەسای سێبەری درەختی ناو گوڵزار
کونجێ بکەین : بەهێلانەو هەوار
دەست لەگەردن ، تاکو مردن، شۆخ و شاد، شۆخ و شاد
خەمی دنیا: بەماچ بدەین بەباد، هەر بەباد...
گۆنات هەڵمژم پڕ بەدەم
سوور هەڵگەڕێ هێندە ماچی کەم..!

سلێمانی 1941

# ڕازی تەنیایی*

ژیان و ئەرکی ناخۆشی ، پەپولەی ئارەزووی کوشتم
شەرابی جامی دڵداری لەتافی لاویدا ڕشتم
تەمی ، ڕۆژانی پڕ مەینەت وەها تاریك و چڵکن بوو
نیگاری خۆشەویستیی دڵ پەری ئاسایی، تیاوون بو
شەوی تەنیایی، رووناکی چرای ئاواتی خنکانم
دەسی ناکامی ئاوازی دەروونی کەیلی، تاسانم
ئەوا ئێستا لەگەڵ زامی
دەروونی پڕ لە ناکامی
ئە پێوم چۆڵی سەرسامی
لەتەنیایی شەوی ژینا ئەنێم هەنگاوی کوێرانە
نیە دەستێ دەرم بێنێ لەناو ئەم گۆڕە وێرانە
نیە جوانێ سەری کاسم بنێتە سەر دڵی نەرمی
کە هیلاکی لەشم دەرکا، خەوی سەر باوەشی گەرمی
ئەگێڕم چاوی بێتینم، بەتاریکی شەوا سەر سام
نیە پرشنگی دووچاوێ کە ڕووناکی بکا، ڕێگام
بەغەیری باڵی غەمناکی
شەوی پڕ ترس و سامناکی
نیە یەك تۆزە ڕووناکی
نیە تەنیا پەری زادێ، کە پاڵم پێوەنێ، نازی
کە بەهرەی سیس و ژاکاوم ببوژێنێتەوە ڕازی
تریقەی ئەو، تەمی ئەم یەئسە ڕامالێ لەسەر چاوم
وەکو لای لایە ژیری کا دڵی منداڵی گریاوم
بەڵی، گوێ هەڵئەخەم بێجگە لەخورپەی سست و لێدانی
دڵی پەستم کە نووزەی دێ بەعاستەم ڕازی پەنهانی
نیە هەر دەنگی هیچ نایە
لەهیچ شوێنێ، لەهیچ لایێ
شەقەی باڵێ، شنەی بایێ

سلێمانی 1951

*ئەم شیعرە هەرچەندە لەساڵی 1951دا ووتراوە ، بەڵام شیوەنێکە ، یان ئاوڕدانەوەیەکە لەقۆناخێکی لەوە پێشتر.. واتە لەم ڕووەوە ، تا ڕادەیەك لە (شانزە ساڵ چاوەڕوانی) ئەچێت.

(أ.ه)



# فەلسەفەی دڵداری*

کەجۆگا تێکەڵی چەم بێ و چەمیش تێکەڵ بەدەریا بێ
شەماڵیش پڕ لەهەستی بێ نیە شت تاکو تەنیابێ
بەقانوونی خودا ئەشیا ئەبێ تێکەڵ بەیەکتر بن
ئیتر، بۆچی من و تۆ تێکەڵی یەکتر ببین نابێ!
کە کێوو کەژ بکەن ماچی هەموو ئاسمانی بەرزو شین
شەپۆلیش هەر وەکو دڵدار لەمل یەك دەستی ئالاّبێ
ئەبەد نابێ : کەخوشکی گوڵ، برای دەرکات و لێی دووربێ
کەتیشکی ڕۆژ، زەمینی هەر وەکو دولبەر، لەکۆشابێ
ئەوا مانگیش ئەکا ماچی بەحر، گەر تۆش نەکەی ماچم..
هەمووی بێ کەڵکە ئەم ماچانە، بێ تۆ فائیدەی نابێ..

بەغدا 1939

شیعری ((شیللی‌یە)) لەعەرەبییەوە کراوە بەکوردی





# ئازادی خوای کوردین ئێمە

ئازادی خوای کوردین ئێمە
شورای پۆڵاو بەردین ئێمە
پشتی جوتیاری زەبوونین
ئاڵای بەرزی چون یەك بوونین
شیری دەستی لێ قەوماوین
لەڕوی زوڵما هەڵکێشراوین
ئاغاو بەگزادانی زۆردار
جەردەی گیانی گەلی هەژار
خوێن خۆری ئەم نیشتمانەن
ئالەتی دەستی بێگانەن
ڕۆژی خۆی گیانیان دەردێنین
تۆڵەی گەلیان لێ ئەستێنین
ئازادی خوای کوردین ئێمە
شورای پۆڵاو بەردین ئێمە
باروت و قورو قوشم و پۆڵا
گوللەی زۆرداری ناقۆڵا
زنجیری سەر بەندیخانە
ڕەشاشی دەستی بێگانە
یەك زەرە کارمان تێناکا
تەرکی ڕێگامان پێناکا
گەر مردووین لەم ڕێگاوبانە
نابین بە پیاوی بێگانە
ناوی ترساندن نازانین
چونکە ساحێبی ئیمانین
ئازادی خوای کوردین ئێمە
شورای پۆڵاو بەردین ئێمە
هەر قەومێ بەرگی زامار بێ
وەك ئێمە دیلی زۆردار بێ
ڕەنجی شانی بۆ ئاغایە
بیکا بەزێڕو سەرمایە
میللەتیش ڕوت و عوریان بێ
موحتاجی یەك پارو نان بێ
لەگەڵ ئەو قەومە یەك جۆرین
دوژمنی ئاغای خوێن خۆرین
پشتی قەومی بێ تاوانین
هاوڕێی ئازادی خواهانین
ئازادی خوای کوردین ئێمە
شورای پۆڵاو بەردین ئێمە





⋆دەسم دامێنت ئەی میللەت ! لەخۆت هەرگیز نەبی بایی
نەهێڵی خوێنی لاوانت ئەبەد بڕوا بەخۆڕایی
بەڵێ ئەو خوێنە تۆ ڕشتت لەجەرگەی کۆڕی مەیدانا
هەزاران مۆری عاری نا بە ڕووی میللەت فرۆشانا
بەڵام هێشتا گەلێ کۆتو گەلێ پێوەند لەپێتایە
ڕێگا ناخۆش‌و دژوارە ، دزو جەردە لەڕێ تایە
سەفیرو زابتانی ئیرتیباتی مامە ئیستعمار
بەسەر سنگی وڵاتا هاتووچۆیانە بەلەنجەو لار
خەریکن ئاگری فیتنە لەناوا هەڵبگیرسێنن
خەریکن چاوی ئەم خەڵکە بەپیلانێ بترسێنن
سبەینێ ئینتخاباتەو کەچی ئەو خائینانەی تۆ
بەسەربەستی بەناو تۆدا هەموو کەوتوونە هاتو چۆ
بەڵێ وا ئینتخاباتەو کەچی هەر قارەمانانە
لەبەندیخانەدا دیلن بەئەمری پیاوی بێگانە
بەڵی ئەو کۆمەڵانەی شیری دەستی میللەتی ڕووتن
لە لای ئەم کاربەدەستانە ئەڵێی بەنزین‌و باروتن
کەچی ئەو کۆمەڵانەی ڕو لەپێوەنگ کردنی گشتین
قەڵای کۆنە پەرستین‌و گەرای جێماوی فاشستین
بەسەربەستی لەڕووی میللەت پەرستانا ئەلورێنن
کەمەندو گورزی ئیرهاب‌و مەترسی هەڵئەسووڕێنن
لەڕۆژو چەرخی ئاوادا کەهیچ حیزبێکی دڵسۆزت
بەسەربەستی نەهێڵن دەربخا ئاواتی پیرۆزت
ئیتر ئەی کێ هەیە ئەمڕۆ کەدەربەستی ژیانت بێ
لەگەرمەی ئینتخاباتا سبەینێ پشتیوانت بێ؟!

⋆ئەم شیعرە بەبۆنەی هەڵبژاردنی نوێنەرانی پەرلەمانەوە لەساڵی 1947 دا نووسراوە

## ئاگری
## سوری ئیرهابی عورفی*

ئاگری سوری ئیرهابی عورفی
شالاو ئەهێنێ مەکەی بۆ نیە
گرانی وەها پێی لێ هەڵبڕی
لەگەلێ مالا نانی جۆ نیە
هەر کەسێ شەکوای حاڵی دەربڕێ
یاشیوعیە یا سەهیۆنیە
حارسی تەختی لەندەنی ڕزیو
چاك بزانە گەل نابڕێتەوە
خوێنی چەند هەزار لاوی خێر نەدیو
نەقشی مێژووەو ناکوژێتەوە
ئەو گەلەی لەخەو ڕاستی بۆتەوە
نابەزێ لەڕێی ئەم ژیانەدا
قاچی ڕۆڵەکەی گەر بەکۆتەوە
هەڵوەرێ لەناو بەندیخانەدا

⋆هەردی ئەم سرودەی بەبۆنەی ڕاپەڕینی کانونی دووەمی ساڵی 1948- داناوە.



# (بۆسەر کێلی گڵگۆی ئازیزان)

کاتێك کە (ڕازی تەنیایی) بۆ یەکەم جار، لە چاپ درا، من تەنیا دوو (چوارینم)، بە بۆنەی مردنی دوو لاوی جوانەمەرگەوە دانا بوو، کە هەردووکیان لە چاپی یەکەمدا نووسراون. بەڵام دوای دەرچوونی (ڕازی تەنیایی)، ناچار بووم تکای هەندێك برادەرو ناسیاوی بەڕێز بگرم و، هەندێك چوارینی تری لەو بابەتە، دابنێم، جا، لەبەرئەوە، وام بە چاك زانی، هەڵبژاردەیەکیان بخەمە دوای دیوانەکەوەو لە شیعرەکانی تری جیابکەمەوە و ناوی‌بنێم: (بۆ سەر کێلی: گڵگۆی ئازیزان)، چونکە هەریەکێکیان، بەو مەبەستە دانراوە: کە لەسەر کێلی، ئەو جۆرە کەسانە بنوسرێت.\

شایانی باسە ئەو چوارینانەی بۆ ئەو مەبەستە دانراون، گەلێك لەوە زۆرترن کە لێرەدا نووسراون، بگرە لەوانەیە: سێ ئەوەندەو چوار ئەوەندەی ئەم چوارینانەی ئێرەبن، بەڵام هیچیانم لەبیر نەماوە و لای خۆشم نەنووسراونەتەوە و وەکو بیرم بێت، هیچیشیان لەو پلەیەدا نەدیوە کە سۆراخێکیان بکەم، تاکو لێرەدا بینووسمەوە.

بەم بۆنەیەوە، پێویستە بڵێم: من هیچ شتێکم ئەوەندەی ئەوە پێ گران نی‌یە، کە لەسەر داخوازی خەڵك شیعر دانێم، بە تایبەتی ئەو شیعرانەی لەسەر کێلی مردوان ئەنووسرێن، بەڵام لەگەڵ ڕوولێنانی دۆست و ئاشنایاندا ئەڵێی چی؟! لەناو ئەو شیعرە کەمانەدا کە لێم وون بوون، تەنیا داخ بۆ (شیوەن)ەکەی (بێکەسی) شاعیر ئەخۆم، کە بۆ یادکردنەوەی مامۆستای ناوبراو دامنابوو لە کۆبوونەوەیەکی سینەمای (سیروان) دا لە سلێمانی خوێندمەوە. داخەکەم لەگەڵ هەموو هەوڵ و تەقەللایەکدا بۆم نەدۆزرایەوە. لە کۆتاییدا هیوام وایە ئەم چەند چوارینە هەڵبژاردەیەشتان وەکو ئەوانی تر بەدڵ بێت..

1984/4/22

ئەحمەد هەردی

1-بۆ (کەمالی جەلال سائیب) ووتراوە، کە لە 1938/7/24دا لە ڕانیە کوژراوە:

**بای ئەجەل هات و لەناکاو، دەفتەری ژینی دڕیم**
**تاکو دوێنێ خونچە بووم، ئەمڕۆ بە ناهەق، هەڵوەریم!**
**وەك بروسکە نەو نەمامێ داڕنێ، وەختێ چرۆ**
**هات و گوللەی وێڵ لە ناکاو، بێ گوناه جەرگی بڕیم!**

(1938)

* * *

2-بە زمان (محەممەد کەریم)ی هاوڕێمەوە ووتراوە کە لەسەرەتای لاویدا خۆی کوشتووە:

**برام وا تێنەگەی ئاخم، لە داخی نائومێدیمە**
**ئەگەرچی زامی سەر سنگم: نیشانەی جوانەمەرگیمە!**
**بەڵام بۆیە دڵم بەر گوللەدا: زانیم کەچی تیایە**
**دڵێ وێنەی کچی تیابێ، نەمانی باشە بۆ چیمە؟!**

* * *

(3)بۆ (مەهتابی شێخ جەلالی شێخ ڕەشید) ووتراوە کە لە هەرەتی لاویدا جوانەمەرگ بووە:

**کە ڕابوردی بە ئەسپایی، لەسەر ئەم گۆڕە پێدانێ**
**کە مەهتابێکی تێدایە، مەگەر ئەو خوایە بیزانێ!**
**لە باخی خۆشەویستیدا، گوڵاڵەی نەوجەوانی بوو**
**کەچی کاتی گەڵاڕێزانی ئەو، هێشتا، بەیانی بوو!**

(1959)

* * *

(4) بۆ (نەژادی ڕەمزی ئەفەندی) ووتراوە کە قوتابی کۆلیجی پزیشکی بوو لە ئەستەمموڵو، لە هەرەتی لاویدا مردووە:

**درەختی ڕەنجی چەند ساڵەم، کەمی مابوو چرۆ دەرکا**
**کەمی مابوو بەری باخم، ژیانم پڕ لە سێبەرکا**
**بە ئەو ئاواتە من ئەژیام، لە کونجی دوور وولاتێکا**
**لە پڕ مردن، تەلاری ژینمی ڕوخان، لە ساتێکا..!**

1969/3/6

* * *

(5) بۆ (شێخ ئەحمەدی شێخ ڕەزا)ی بەرزنجەیی ووتراوە، کەلە نەخۆشخانەی سلێمانی کۆچی دوایی کردووە:

**هەتا مابووم، دەسی تاسەم، نەگەیی‌یە چاکی دڵخوازێ!**
**نەهۆشم مەستی بۆنێ بوو، نە گوێچکەم کەیلی ئاوازێ!**
**کە مردیشم لە ژوورێکی: نەخۆشخانەی سلێمانی**
**نە دڵسۆزێ لە دەورم بوو، نە کەس بەو مردنەی زانی!**

* * *

(6) بۆ (شێرزادی کاکە جەزا) ووتراوە کە لە کۆلیجی کشت و کاڵ لە هەرەتی لاویدا، کۆچی کردووە:

**هەموو ئاواتی ناکامم: گوڵاڵەی لالە زارێ بوو**
**شریتی سەرگورشتەی من: خەوێکی نەوبەهارێ بوو**
**هەموو پێچانەوەی ژینم، بریتی بوو: لە چیرۆکێ**
**لە کورتی و زوو بەسەرچوونا: بزەی سەر لێوی یارێ بوو!**

1980/3/17







# ڕازی تەنیایی

**کۆمەڵە شیعرێکی (ئەحمەد هەردی)یە، لە 32 لاپەڕەی ناوەندیایە. چاپی لەسەر ئەرکی جەمال خەزنەدارە. پێشەکیەکەی هی مارف خەزنەدارە.**

**بەپێ نووسی مامۆستا —ف-***

هەر هەڵبەستەی کە لەدەمی خاوەنەکەی کەوتە خوارەوەو خەلکی دەستاو دەست قۆستیانەوەو یاکونو کەلەبەرو دوو توێی کتێبی بۆ پشکنینو عەودالْ بوون بەدوویا دیارە ئەوە (شیعرێکی زیندووە) چونکی توانیوێتی تەلی هەڵبەستەکانی لەدەماری دڵی خەڵکی دروست کا، کە ئەمەش هونەرێکی کەم نیە. بەپێچەوانەی ئەمەوە شیعری مردووش ئەوەیە هەر لەدەمی خاوەنەکەی کەوتە خوارێ هیچ دەماری نەبزوێنێ دیارە ئەوحەلە دەمو چاوی لێ گرژ ئەکریو ڕوی لێ وەرئەگێڕرێ. جا شیعرەکانی مامۆستا ((هەردی))ش ئەو گوللە تۆپانەیە کە هەر لەگەڵ گرمەیان کرد لەدڵی خەڵکیا ئەتەقیەوەو هەموو تەقینەوەیەکیشی مۆرکی ڕازی بوونو پەسەند کردنی بێ چەندو چوون بووە.

کەواتە هەڵبەستەکانی هەردی بۆ خەڵکە نەك بۆ خۆیو ئەوانەی چاپ کردنی ئەم هەڵبەستانەیان لەکەڵلەدا بووە زۆرتر لای ئەمو ئەوی بۆ گەڕاون نەك خۆی. بەپێویستم زانی بەم چەند دێڕەی سەرەوە ئەم لێ دوانەم داڕێژم ئینجا بێمە سەر (ڕازی تەنیایی) خۆی.

سەرەتاکەی مامۆستا (هەردی)م لەدووسەرەوە پەسەند کرد یەکێکیان ئامۆژگاریەکی دڵسۆزانەی بۆ هەموو گەنجێکی کورد کە گوێیان بەئاوازی گریاناویو لاواندنەوەی ئافرەتو دڵداری نەئاخنرێت بەڵکو بەجۆرە ئاوازێکی تر کە دیارە چی‌یەو پێویست بەلێدوان ناکات.

سەرەکەی تریان ئەو (هەردی)یەی مارف خەزنەدار لەپێشەکیەکەیا بەهاوڕێی دەستە ڕاستی گۆرانی دائەنێ ئەو (هەردی)یە بەهەموو لەخۆبووردنێکەوە دەڵێ (ئینجا ئەگەر ئەم چەند هەڵبەستە خزمەتێکی بچووکی زمانە خۆشەویستەکەمان بکا ئەوا خۆم زۆر بەبەختیار ئەزانم با (هەرزن) یش بێت هەر جێی سوپاسە).

بەلای منەوە ئەم لەخۆ بووردنە گیانێکی رێك و ڕەوانی هونەرمەندێکی ڕاست دەرئەخا.

پێشەکیەکەی کاك (مارف خەزنەدار)یشم لەدوو سەرەوە پەسەند کرد، یەکەمیان شی کردنەوەو وورد کردنەوەیەکی تەواوی هەندێ لەهەڵبەستەکان، دووەمیان هێناوێتی پێشەکیەکەی بە(سڵاو بۆ کوردستان) دەست پێ کردووە کەلێش بۆتەوە بەهەمان تاڵە دەزوولەی زێڕین تونگ بەستوویەتی و گرێی داوە وەئەشبێ هەر وابێ هەموو هەوڵ و تەقەلایەکمان بەسوود مەندی کوردستان بپێوین و هیچ شتێکی ترنەکەین بەماڵ بەسەر خۆمانەوە.

ئەمێنێتەوە سەر باسی هەڵبەستەکان من ئەم ویست لەوەستایەتی هەردی و سەرکەوتنی لەوێنە گرتنی پەنگ خواردنەوەو بەیەکا هاتنی هەستی دەروون درووست کردنی مانای تازەو مۆسیقای هەڵبەستەکان بدوێم بەڵام وائەزانم کاکی خاوەن پێشەکی تا ڕادەیەکی زۆر لە ساغ کردنەوەیانا سەرکەوتووە بەڵام ئەوی مەبەست بوو جگە لەوانە بیڵێم ئەوەیە کە سەرنج دانە شیعرەکانی هەردی، دوو شاعیری نەتەوەکەمان (بێکەس)و (پیرەمێرد) دێنێتەوە یاد، بێکەس کەوەستایەکی شیعری (توانج و پلار بوو) سەیری ئەکرد نەزان و نەفامان باویان هەیەو بازیان سوارە، پێگەیشتوان و هوشیارانیش فەرامۆش کراوو پەك خراون، ناچار توانجێکی ئەگرتە ئەو شیرازە تێك چوونە بەنیازی چاك کردن و ڕاستکردنەوەیی و ئەیووت :

گەرچی زۆر جار پێم ووتون تێ بگەن
زوو پێبگەن
بەوقسانەم ئێوە قەد باوەڕ مەکەن
سەگ بووم وەڕیم

لێرەدا ئەم توانج و تانووتە تیرێکی ئاراستە کراوی سەردڵی نەزانی و نەفامی یە. لەهەڵبەستێکی کەی دا بەبۆنەی دروست کردنی چەکی کوشندەو وێران کەرەوە هەر بەشێوەی توانجاوی ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| تف لەعیلم و سنعەت و سەد کارەبا | مەرحەبا ئەی جەهل و وەحشەت مەرحەبا |

جا هەردیش کەسەیر ئەکا وا ڕییا لەو پەڕیایەتی ئەوی دوێنێ لافی زۆر شتی لێ ئەدا وائێستا فلچەیەکی بەدەستەوەیە خەریکی تەکاندنی شانی خاوەن پارەی ئەمڕۆیە بێ گوێ دانە ئەوەی چاك بی یان خراپ، دۆست بێ یا دوژمن، لەکاتێکا زۆربەی خەڵکی وەها بێ، هەڵبەستی (تەپڵی بەتاڵ) تیژترین توانجە بۆ ئەوانەی کەڕاست گۆیی و وڵات پەروەریان لاوەك تەپڵی بەتاڵە دەنگی هەیەو ڕەنگی نیە.

ئەگەر هەڵبەست ئاوێنەی کۆمەڵ بێ ئەو هەڵبەستە مێژوویەکی ڕاستی ئەم دەوروبەرەی ئێستایە بەتایبەتی کە تیژترین تیری تانوتیان تێ ئەگرێ و ئەڵێ:

نەمزانی ( ئەتیکێتی ) سەدەی تازە ڕییایە
ئادابی لەلایە ئەوی وەك ( لۆتی ) وەهایە

هاتنەوە یادی شیعرەکانی پیرەمێردیش لەشیعری هەردیدا لەڕووی وەستایەتی و دەربڕینی مەبەستێکی زۆرە بەتەنها ووشەیەك یا دووان لەچوارچێوەی هەڵبەستێکا کە بۆ دەربڕینی ئەو مەبەستە نەوترابی ئەبینین پیرەمێرد لەهەڵبەستی (زستانی سلێمانی)دا کەسەرتاپا باسی زستانە ئەڵێ:

ئەڵێن بەرگی فریشتەی ئاسمانیش سپی یە وەك بەفرە
فریشتەی ئێمە بالایە بەڵام چی بکەین لەگەڵ ( تەفرە )

لێرەدا ووشەی ((تەفرە)) دەردێکی کۆمەڵایەتیمان نیشان ئەدا کە هەر وەستایەتی پیرەمێرد توانیوێتی لەناو هەڵبەستێکا کە بۆ مەبەستێکی تر وترابێ وا بەجوانی کۆی کاتەوە.

دیسانەوە (هەردی)یش لە (16 ساڵ چاوەڕوانی) پەری نیگارێکا بەرێکەوت دێتە سەرباسی ژیانی ئێستاو ئەیەوێ بەیەك دوو ووشە لێی بدوێ و بگەڕێتەوە سەر باسەکەی خۆی ئەڵێ ئەو ژیانە (کەشەوقی چەندە گەنجی هەژاری تیا ڕزاوە) بتەوی ئەم یەك دوو دێڕە خاو کەیتەوە ئەبی تۆمارێکی لەسەر بڕۆیت بەلام ئەو هەموو مەبەستە لەو یەك دوو ووشەیەدا وەستایانە دەربڕراوە. ماوەتەوە سەر ئەوە سەرنجی کڕیارانی ئەم (ڕازی تەنیایی)یە ڕاکێشم کەلەلاپەڕەی (25) لەدوا پێنج خشتەکی دا دێرێك دوای (دەرچم و دوایی.... ) هەیە پەڕیوە ئەویش ئەمەیە (پێی وتم بێ سوودە هەوڵت تاکو ماوی جێگەتە). وە لەلاپەڕەی 28 ی هەڵبەستی (من و تۆ) دێڕی دوای (دڵی تۆ زێڕی...) هەیە پەڕیوە ئەویش ئەمەیە ( ئەمانە گەرچی تێ ناگەم بەڵام پێویستە بیزانی).

***

*ئەم ووتارە بەناوی مامۆستا —ف– مامۆستا (فەرەیدون عەلی ئەمین)ە لەژینی ژمارە 1348 بڵاوکراوەتەوە.

*((ڕیالیزم لە ئەدەبی کوردیدا))

پرۆفیسۆر: عیززەدین مستەفا رەسوڵ

ڕۆڤار

لەعەرەبییەوە کوردیە بەکوردی

بزاوتی ڕیالیزمی نوێ لە ئەدەبی کوردیدا بووە مایەی خوڵقاندنی چەند ئەدیبێك کە ڕیالیستیانە هاتنە ئاراو ژان و چەوساندنەوەی گەلەکەیان لەبەرهەمەکانیاندا ڕەنگی دایەوە، پێشەنگی ئەوانەش (ئەحمەد هەردی) بوو کە بەسروودی (ئازادی خوای کوردین ئێمە) پشتیوانی لەو پێشکەوتن خوازانەی دنیا کرد کە زۆربەورەی بەرزەوە دژایەتی دەرەبەگی نێو جیهانی دەکەن لەپێناوی دابین کردنی زەوی بۆ جوتیاران. هەر لەسۆنەی ئەو پێشکەوتن خوازیەوە شاعیر بەئاقاری چینی کرێکاردا ڕۆیشت تاپێشڕەوایەتی خەباتی گەل بکەن دژی داگیرکەر. بەڵام هەردی لەو بەرهەمانەی دواییدا دەربڕی ڕازی ئەو دڵە ڕاوکێیە بوو کە تووشی بۆرژوازی بچووك دێ و چۆن لەگەڵ یەکەم نسکۆدا کۆل ئەداو ترس بەرۆکی پێدەگرێ.

هەروەکو لەسەرەتای هەڵمەتی تۆقێنەرانەی ساڵی –1949–دا هەردی لەمەڕ بەرزی ورەو بەرەنگار بوونەوەری تێکۆشەرانی گەلەکەی دەدوێ و لە شیعری (ئاگری شینی ئیرهابی عورفی)دا ئەوە بەئاشکرا دیارە.

پاش شکست هێنانی بزوتنەوەی نیشتمانی شاعیر بەئاقارێکی تری دوور لەئازارو ژانی گەلەکەیدا چوو بەرەو دنیای ئەوینی شۆخێکی دوور ڕووی نا :

(( باڵەدەستی ژینی پەستی شارو دێ
ڕابکەین و ڕوبکەینە چۆڵ و هەردێ )).

هەردی لەڕێی ئەو شیعرانەوە ستایشی خۆشەویستەکەی دەکات بەڵام وای دەبینێ لە کۆمەڵەکەی ئەودا ژیانی ئاسودە تەنیا بۆ دەست ڕۆیشتوانە هەر بۆیە ئەوینی نائومێدانەی خۆی دەنێتە گۆڕو بیرەوەریەکانی ئەداتە دەم باو بۆ تەنیایی خۆی دەگری:

(( ژیان و ئەرکی ناخۆشی پە پوولەی ئارەزووی کوشتم
شەرابی جامی دلداری لەتافی لاویدا ڕشتم ))

هەردی لەو تەنیایی و چاوەڕوانی دەرگای بەزەییەدا لەنائومێدی زیاتر هیچی دی بەدی ناکا بۆیە بەناخی خۆیدا شۆڕ دەبێتەوەو تەنیا ئاسودەیی لەو ڕۆژانەدا دەبینێتەوە کە سرودی بۆ گەلەکەی دەچڕی:

(( ئەوی یەك تۆزە ڕوناکی ئەدا بەم ژینە شێواوە
دڵێکی پڕ لەئاوات بوو کە ئێستا پاکی ڕوخاوە
بەڵێ ئەوسا دڵێکم بووکە سەرچاوەی ژیانم بوو
دڵێ سەرچاوەی ئاوات و تەوژم و تینی گیانم بوو ))

لەگەرمەی شۆڕشی نائومێدیدا، شاعیر لۆمەو گازندە لەکۆمەڵگەکەی دەکاو وای دەبینێ ئەو ئاسوودەییەی خواستی ئەو بوو لەو ڕوانگەیەوە نەهاتەدی چونکە کاڵا ئاسا لەکچ دەڕوانێ بۆیە دەڵێ:

(( کچ لەلای ئێمە گوڵێکە بۆیە پەروەردەی ئەکەن
تاکو بڕازێنێتەوە مێزی شەرابی دەوڵەمەن ))

شاعیر دەیەوێ لەو ململانێیەدا لەگەڵ تێکۆشەراندا بێ چونکە خۆشبەختی لەوەدا ئەبینێتەوە، هەروەکو لەم ڕوانینەیدا بەدی دەکرێ، ئەوی بەتەنیا ژیانی ویست ئەوە شیاوی ژیان نیە. ئەوەتا لەزمانی لاوێکەوە کە لەئاکامی ناموراد بوونی لەچیرۆکێکی دڵداریدا خۆی دەکوژێ، دەڵێ:

بـرام واتێ نەگەی ئاخم لەداخی نائومێدیمە
ئەگەرچی زامی سەرسنگم نیشانەی جوانەمەرگیمە
بەڵام بۆیە دڵم بەرگوللەدا: زانیم کەچی تیایە
دڵێ وێنەی کچی تیابێ، نەمانی باشە بۆچیمە؟!

***

*ڕیالیزم لە ئەدەبی کوردیدا–ناونیشانی ئەو کتێبەیە کە (پرۆفیسۆر عیززەدین مستەفا رەسوڵ) بەزمانی عەرەبی نووسیویەتی و (المكتبة العصرية) لە –(بیروت). بۆی چاپکردووە ئەم کورتە باسەش لەدوتوێی ئەو کتێبە وەرگیراوە.





# لە بیرەوەری

# (ئەمین زەکی بەگ)دا.

**بە قەڵەمی: ئەحمەد هەردی**

نازانم "ئەمین زەکی بەگ" "مێژووزانێکی" گەورە بوە یا "مێژووی نوسێکی زانا" چونکە زانین و ساغ کردنەوەی ئەوە ئەکەوێتە سەر شانی "مێژوونوسەکانی" دوارۆژ، بەڵام ئەوەندە ئەزانم کە حوکم دانی (ئەمین زەکی) بەسەر شتا وەجۆری لێ کوڵێنەوەی لە دەرخستنی قەوماوەکانی مێژوودا لە لێکۆڵینەوەو حوکم دانای "زانا" یەك زیاتر ئەچێ چونکە دەردی کابرا ئەڵێ "نەزان یەکەن دەردو حوکم ئەدا بەسەر شتاو زانا تێبینی ئەکا ئینجا حوکم ئەدا بەڵام فەیلەسوف هەر لە سەرەتاوە "گومان" ئەکا، نوسینەکانی (ئەمین زەکی بەگ) هیچ وەختێ بۆنی ئەوەی لێ نایەت کە قەڵەمێکی هەرزەی سەرچڵ نوسیبێتی، ئەو قەڵەمانەی کە تەنیا ئیمانێکی گەرم ئەیان خاتە سەر قاقەز، وە بۆ ساغ بوونەوەی قسەکانیان بە تەنیا سوکە بەڵگەیەك هەزارو یەك پەڕیان پێ رەش ئەکاتەوە. بە کورتی بڵێم: هەرگیز "زەکی بەگ" ناچی "ئادەم، حەوا" و دارو دنیا بکا بەکورد بۆ ئەوەی کورد پەروەری خۆی دەربخا، یان میللەتی کورد بە گەورە بداتە قەڵەم، بەڵکو زۆر بە ئاغرانە دەس ئەکا بە بەڵگە هێنانەوە ولێکۆڵینەوە ، هەتا زۆرترین کەس لە شتێکا قسەیان یەك ئەکەوێت، ئەو قسەو بڕوایە پەسەند ناکا.

بەلی! دیمەنی دیاری ئەمین زەکی بەگ ئاغریە، ئاغری لە هەموو شتێکا، لە نوسینا، لەرەوشتا، تەنانەت لە سیاسەتا.

بۆ راست و دروستی ئەم قسەیە ئەتوانی سەرنجێك لە ژیانی (ئەمین زەکی) بدەی وە بزانیت ئاخۆ هەرگیز بە درێژایی ژیانی تێکەڵی هیچ قەومیەتێك بوە؟ لە وەڵاما بێگومان ئەڵێی نەخێر! چونکە مێژووی عێراقی تازەمان لەبەرچاوە کە گەلێ جار تۆفو گەرداوی سیاسەت گەلی لاوی کوردو عەرەبی راپێچ کردووە، بگرە گەلێ پیاوی گەورەی گرمۆڵە کردوە، و لول داوە، بەڵام هەرگیز تۆفو گەرداوی سیاسەت نەیتوانیوە جێگەی ئەمین زەکی لێژ بکا.. هەروەها لە ژیانیشا کەس نەی دیوە ئەمین زەکی قسەیەکی ناشیرین بکا، یان کارێکی وای لێ بوەشێتەوە کە لە ئاغریەوەیە دەربیت.

بە کورتی مامۆستای خوا لێخۆش بوی گەورەمان یەکەم مێژوو نوسێکی ئاغرە کە جۆری لێکۆڵینەوە و حوکم دانی بەسەر شتا قاپیەکی تازەی خستە سەر پشت لە نوسینی مێژوی کورددا بەتایەبەتی وە لە نوسینی کوردیدا بە تێك رایی کە ئەتوانین ناوی بنێین: لێکۆڵێنەوە یەکی ئاغرانەیی دور لە ئارەزوو.

# لە بیرەوەری

# عەبدولواحید نوریدا

دوو شت لە رەوشتی (عبدالواحد نوری)دا، لە هەموو شتێکی تری، زیاتر شایانی باس کردنە، بەلای منەوە.

یەکەمیان: گیانێکی سپۆرتی بەرز: مامۆستا عبدالواحد بە پێچەوانەی گەلێك لە نوسەرەکانی ئیمڕۆ گیانێکی "سپۆرتی" هەبو بەرامبەر رەخنەگرتن. هەرچەندە رەخنەت لێ بگرتایە، وە هەرچەندە نەش هاتایە سەر قسەکەت، بەڵام هەرگیز رقی لێت هەڵنەئەستاو، لێوی نە ئەکرۆژتی.

لە بیرم دێ هێشتا قوتابیەکی نە ناسراوی خاو بووم، گەلێك جار لە روی راست کردنەوەی زبانەوە قەڵەمم ئەخستە نوسینەکانیەوە، نەك هەر من بەڵکو گەلی هاوڕێی تریشم. بەبێ ئەوەی رومان لێ گرژبکا، بەڵکو بە زەردەخەنەیەکەوە ئەی وت (شەرم مەکەن! چیتان بەدڵ نەبو، راستی کەنەوە) بەم گیانە بەرزەوە رەخنەی ئێمەی وەرئەگرت کە هەموو قوتابی خۆی بوین.

دوهەم: ساردنەوە بوو نەوە هەتا مردن: کە ئەڵێم هەتا مردن مەبەستم (مبالغە) کردن نیە وەکو ئەو نوسەرانەی "مبالغە" لە شوێنی وادا بەجوان ئەزانن، بەڵکو بە ڕاستی مەبەستم (تا مردنە) چونکە لە بیرم دێ نەخۆشی سیل زۆری لێ سەندبو، دەنگی بە تەواوی نوسابو، موتالا کردن و ماندو بوون زیاتر ژیانی ئەخستە مەترسیە. ئا لەم کاتەدا لە بیرم دێ چومە لای..

چی ببینم باشە؟ بینیم خەریکی نوسینە! چەند وتارێکی (ه. ج. ولتری) لەبەردەستایە خەریکە ئەیان کات بە کوردی، لەو لاشەوە "ناميلکە"یەکی داناوە بە تەمایە تەواوی کات، بەڵام لە پێش ئەوەدا من دەم بکەمەوە، خۆی پێشم کەوت و بە دەنگە نوساوەکەی وتی "برا! سەرت سوڕنەمێنێ من ئەزانم ئەوەندەم نەماوە لە دنیادا. لەبەر ئەوە بە پێویستی ئەزانم؟ هەتا ماوم، چیم لە دەس دێت بیکەم!"

بە راستی لە خۆبردن هەتا ئەم رادەیە ئەوپەڕی کۆڵ نەدانە.

لە دەمێکەوە ویستومە ئەو سەرچاوەیە بدۆزمەوە کە ئەم دو شتەی (عبالواحدی) لێ هەڵئەقولا لەدڵ سۆزی بەو لاوە هیچیترم نەدی. چونکە کەسێك دڵسۆز نەبێت لەدوا قۆناغی نەخۆشیەکی وا کوشندەدا پێویستی بیر ناکەوێتەوە! رەنگە ئینسان لە ژیانا بۆ ناوبانگ و ناونیشان وە جێگە بنوسێت، بەڵام کە دەستی لە ژیان شت تەمای هیچ شتێکی نامێنێ لەبەر ئەوە ئەو شتەی کە لەم کاتەدا پاڵی پێوە ئەنێ بۆ ئیش کردن بێگومان گەلێك بەرزترە لە ناو و نیشان و پایەی ژیان!

بۆچی وا دوور بڕۆین، کەسێك دڵسۆز نەبێ بۆ قازانجی گشتی، خۆ پەرست ئەبێ، وە کە خۆپەرستیش بوو ناتوانێ بەگیانێکی (سپۆرتە)وە بەرەنگاری رەخنەگرتن بکا وەکو (عبدالواحد نویی). بێگومان گەلێك کەس بەبیروباوەڕی عبدالواحد ئەتوانن بڵێن راستە یان چەوتە، وە بە نوسینەکانی بڵێن جوان یا ناشیرینە، بەڵام هەرگیز کەس ناتوانێ دان بەوەدا نەنی کە عەبدولواحید نوری پیاوێکی هێجگار دڵ سۆزو، دڵودەرون پاك بوو، وە هەموو ئیشوکارێکی لە سەرچاوە دڵێکی پڕ لە دڵسۆزیەوە ئەهاتە دەرێ..







# مەدهۆش
# و
# شیعر

پێشەکی:

زۆر دەمێکە ئاواتە خواز بوین، کە ئەم گۆڤارە تاقانەیە چەند پەڕەیە بۆ (ڕەخنە بازی) تەرخان بکا، وەکو هەمو گۆڤارە بەرزەکانی تری خەڵکی، چونکە ئادابی گەلێك بەهانە هانە و پاڵ پێوەنان، یا سەر پەرشتیو ڕێ پیشان دانی ڕەخنە بازی پێش ئەکەوێ.

وە بەتایبەتی بۆ ئەم گەلەپاش کەوتوەی ئێمە کە هەر کەسێك دێڕێك بنووسێ یا هەڵبەستێ بەئەدیبو شاعیر ئەناسرێ. وەیەکێکیش کە بەئەدیب ناسرا لەناو خەڵکا– با واش نەبێ– خوێندەواری تازە پەیڕەو لاسایی دەکەنەوە ئەمەش دەردێکی پیسو کوشندەیە چونکە ئەدیبی گەلێك کەنەزانێ بەری نووسین بەکوێوەیە، ئەی ئەوانەی لاسایی ئەکەنەوە.ئەبێ نوسینەکانیان چۆن بێت؟! لەبەر ئەمە مـن لەمـەو دوا خـوا یاربێ دەس ئەکەم بەشەن کردنی هەر (نوسینێك) کەلەتوانامابێ، تاکو پوش و کای لێك جیا بکەمەوە. وە نیازی هەرە گەورەم لەمە ئەوەیە : کە ئەدیبە گەورەکانمان ئەمە نەخەنـە پشت گـوێ. ئـەوا یەکـەم جـار لـە(مـەدهۆش) ئـەدوێم بەبۆنـەی ئـەوەوە کەهەڵبەستێکی لـە (گـەلاوێژ)ی ژمـارە (7)ی سـاڵی (4)دا نوسـیبو بـۆ هـی تریـش (کنگرو ماست بەوەقتی خۆی).







حەزم لێکردوی:

لەپێش ئەوەدا کەهەڵبەستی (مەدهۆش) بخەمە ژێر تینی وردبینەوە پێویستە کە بڵێم: ئەم کورە لەچاو ئەوەدا کەخوێندنێکی باش وەسەقافەتێکی بـەرزی بـۆ ڕێـك نەکەوتوە هێشتا لەگەلێك لەخۆی خوێندەوار تر باشترە وەسۆزێك لـە شیعرەکانیا هەیە..، بەلاّم کەسێك کە لە (گەلاوێژ)دا نوسی چاوی لێ ناپۆشرێ چونکە (گەلاوێژ) ئاوێنەی گەلێکە وە هەمووکەسێك هەتا بێگانەش ڕەنگە بەرچاوی بکەوێت. بابێینە سەر ئەو هەڵبەستەی. کەلە سێ یەم پارچەیا ، ئەڵێ:

**((تیری جوانیت جەرگی بڕیوە**

**مەینەتی باخی ژینمی چنیوە...))**

ئەبێ نیازی لە(مصرعی) دوهەمی ئەم (بەیتە) چی بێت؟

مەینەت (من بیزانم) مەعنای ئەرك و ناخۆشیە. ئینجا کە : ناخۆشی باخی ژینی چنیبێت– چۆن گلەیی لێ ئەکاو ئەڵێ : ((خۆشیم نەدیوە))؟! ئەمە بەدوو ڕەنگ لێك ئەدرێتەوە: یەکەمیان — یان ئەبێ مەعنای (مەینەت) نەزانێ ، یان — زانیویەتی بەلاّم یاری پێکردووەو بە سەردەمیا هاتووەو ئاگای لێ نەبووە. لەوەش وازبێنە. بڕوانە لە پارچەی پێنجەما ئەڵێ:

**((هەرچەند ئەزانم کە بێزاری لێم**

**دڵت لەسەر من نیەو ناتەوێم....))**

بەڵێ ! واتێ گەیشتین کە خۆشەویستەکەی لێی بێزارەو حەزی لێ ناکا وە دڵی یادی ئەوی تیا نیە. ئینجا دوای ئەوە لەپارچەی شەشەما ئەڵێ:

**بیانووم پێ مەگرە بەسە دیدەکەم**

**چی لەدڵتایە دەریخە کەم کەم...))**

سەیرە ! کە حەزت لێ ناکا ((وەکو خۆت ووتووتە)) دیارە کە دڵی خۆشەویستی تۆی تیانیە. ئیتر چۆن لێی ئەپرسیت ((چی لەدڵتایە دەریخە کەم کەم))؟ لەپاش ئەوەی کە زانیت دڵی هیچی تیانیە چۆن ئەپرسیت (چی لەدڵتایە))؟ یاخود کە مەینەتی باخی ژینی چنی بیت، چۆن دڵی لەتۆ بێزارەو تۆی ناوێ؟ یان ئەگەر تۆی بوێت بۆچی ئەپاڕێیتەوە، گلەیی ئەکەی، وەبەردەرگای ئەگریتو بەزۆر دوای ئەکەوی؟ ئەگەر تۆی بوێ پێویست بەزۆر نیە بەئارەزووی خۆت ئەتوانی دوای کەوی وەبیبینی.

گەلاوێژ ژمارە (9) ساڵی (4)

## سۆزی دەرونی

## خۆزگە بەخوشکە خۆشەویستەکانم:

لەچیرۆکی گوێ ئاگردانا ئەگێڕنەوە کە : ((کوڕێك زۆر دڵی بەکچێکەوە ئەبێ، هەروەها کچەش زۆر کوڕەی خۆش دەوێ، بەلاّم لەبەر ئەوەی کوڕە زەردوویی ئەبێ کچە زۆر جار لەبەرەو ڕووی خۆی بە داخەوە ئەڵێ: ئەگەر ئەم زەردوویيەت لەکۆڵ ئەکەوت جوانترین و شۆخترین کوڕ ئەبویت لەناو کوڕانا.. کوڕە ئەمە ئەگرێتە دڵ بەلاّم هیچ دەنگ ناکا، تا ڕۆژێك سەری خۆی هەڵ ئەگرێت و ڕووئەکاتە شاخ و کێو ، چەند شار ئەگەڕێت، چەند ناخۆشی ئەچێژێت، چەند دکتۆر ئەبینێت، چەند لەگژوگیا دەرمان درووست ئەکا هەتا دەرمانێك ئەدۆزێتەوە کە ئەو ڕەنگە زەردەی ئەکا بەڕەنگێکی جوان و سوور و سپیبێ هاوتا بەم ڕەنگە شارەزای هەموو نەخۆشیەك ئەبێ وە ئیتر مەیانی سکالاّی خۆشەویستەکەی نادا..))

نازانم ئەم چیرۆکە ڕاستە یان درۆیە بەلاّم ئەوەندە ئەزانم ئەوەی ئەم چیرۆکەی داناوە نیازێك و مەبەستێکی زۆر بەرزی بوە چەند شتێکی ڕاستە: کە وشەیەك لەدەمی ئافرەتێك بێتە دەرێ پیاوێك وێڵی شاران و شاخ و کێوان بکا وە لەهیچی نەبووەوە بیکا بەدکتۆر، بەڕاستی بەشێوەیەکی جوان بایەخی ئافرەتمان تێ ئەگەیەنێ. چ پیاوێك هەیە ئافرەت داوای ئیشێکی لێ بکا و هەموو هێزێکی بۆ ئەو ئیشە بەخت نەکا بۆ ڕەزامەندی ئەو ئافرەتە؟ بڕوانە چەند بلیمەتی گەورە بەهانە هانی ئافرەت و دڵخۆش دانەوەی پێ گەیشتوون!.. چەندیان ئافرەت نەبوویایە ناویان لەکولەکەی تەڕیشا نەدەبوو !..

(کمال ئەتاتورك) ئەگەر چاوی (فکریە) دڵی شکاوی دەرمان نەکردایە هانە هانی ئەو چرای هیوای هەڵ نەکردایە، زەردە خەنەی ئەو سەختی ژیانی بۆ ئاسان نەکردایە چۆن لەو پیاوە نەخۆشە ، لەگیان بێزارە، نا ئومێدەوە، ئەبو بەو بلیمەتە گەورەیە !

هەروەها (ئەناتول فرانس) و(ڤولتێر) و(گۆتیە) و(شیللی)، ئێستا کێ ناوی ئەزانێ؟. بەڵکو ئەگەر هەر کچێك ڕەوشتی باشی لەو کوڕە بویستایە کەشوی پێ ئەکا، ئێستە چەند کەس وازی لە بەدخوویی ئەهێنا؟ بۆ ئەوەی چاودێری بکا، هەرچی ئەو بە زەردە خەنەیەك یان بەووشەیەکی ناسکی هانی بدا بی گومان ئەوشتە (سا چ ئەدەب بێ، چ فەن بێت ، چ ڕەوشتی باش بێت) گەلێ پێش ئەکەوێ فرە بەرز ئەبێتەوە. ئینجا خۆزگە هەمو ئافرەتێکمان نرخی ئەم جێ بەرزەی خۆی ئەزانی هەتا بەتەواوی پێویستی خۆی بەجێ بهێنایە، و سەرپەرشتی هەمو جوڵانەوەیەکی باش و ڕەوشتێکی بەرزی بکردایە. وە خۆزگە باوکەکانمان ئەمەیان بزانیایە تا ئەوانیش بەم ڕەنگە بۆ ئەم نیازە ئافرەتیان بەخێو بکردایە، بەڵێ خۆزگە باوکەکان ئەمەیان ئەزانی تا بایەخی کچانیان بزانیایە و بەپارە نەیان فرۆشتنایە!..

***

# له هەر مەیانێکا تاوێک

**((لەمەیانی کۆمەلاّیەتیا لەمەیانی شیعرو ئەدەبا، لەمەیانی رەخنـەبازیا (نقد)، بەکورتی لەهەر مەیانیکا ویستم بەئەسـپی قەلّـەم تـاوێك بـدەم وەلام وایە ئەگەر کەلّکیشی نەبیّ کەلای من کەلّکی زۆرە- لەتام‌و بـۆ بەدەرنیە..))**

**هەردی**

له کوێیت ئەی بەختیاری (سعادت)؟

شـەوێکی تۆفو سـەرمایە کـەس لـەدەرەوە خـۆی پـیّ ناگـیریّ، تـاریکی لەسـەر زەمین خێوەتـی هـەڵداوە هـەمو عـەردو بـەردی داپۆشـیوە. بـارانو ڕەشـەبا کـارێك ئەکەن، ئەڵێی ، ها ، ئێستا، ها، ساتێکی تر دنیا کاول ئەبیّ هـەرچ کـەس لـەکونی خۆی خزاوە له سەرمانا: باڵندە، جانەوەر، چوارپیّ، هەتا دڕندەی کێوی لەترسی سـەرما چۆتـە کونـی خۆیـەوە. کـەچی.. ئادەمیزاد– ئادەمیزادی سەرسـەختی بـیّ ئارام، لـەم کاتـە ناخۆشـەدا، بـەم تۆفـو سـەرمایە، لـەناو بەسـتەڵەکی (روسـیا)دا یـەکتری دائەپاچنو یـەکتری ئاگرباران ئەکـەن !. خـوا ئـەیزانیّ لـەم کاتـەدا سـەری چـەندان هـەزاران گـەنجو تاقانـەو تـازە زاوا بـەدەم گوللـەوە ئـەناڵێنیّ، لـەپاش هەناسـەیەك بـەفر لاشـەیان دا ئەپۆشـیّ وەکـو لـە ژیانیشـا نـەبووبن! ئیـتر کـە سوکاریان جارێکی تر بەچاو نایان بینن. ئۆف لـەدەس ئادەمیزاد! لـەلای خـۆی بـەرەو شارستانی ئەڕوا، بەدرێژایی سالّ خـۆی لەزانسـتی‌و پێش کـەوتن نزیـك ئەکاتـەوە، کـەچی لـەپڕ بەسـاتیّ ئـەو هـەموو پێـش کـەوتنوو زانسـتیەی لـەبیر ئەچێتەوە، بەرگی دڕندەیی لەبەر ئەکا، ڕەنجی هـەزار سالّەی خـۆی بەهەناسـەیەك بە ، با، ئەدا!..

لەهـەمووی سـەیرتریش ئەوەیـە : ئەوانـەی ئـەم ئـاگرە هـەڵ ئەگیرسـێنن ئـەڵێن ((ئێمە بۆ بەختیاری گەلەکەمان ئەمە ئەکەین!.))

بـەڵیّ بـە بـەختیاری گوێـی ئـەم ئـادەمیزادە کاولـەیان پـڕ کـردوە. بـەناوی بەختیاری‌یەوە ئەیان دەن بەکوشت..!

***

سـەیرە ئـەم ئـادەمیزادە، لەسـەرەتای ژیانـەوە حەسـانەوەی نیـە بـەدوای بەختیاریا ئەگەڕیّ، بەم دەسو بەو دەس ئیش ئەکا، لە ژێر ئـەرزو لەسـەر ئـەرز ولـەئاسمان تەقـەلا ئـەداتو تـیّ ئەکۆشـیّ خـۆی ئـەدا بـەدارو بـەردا هـەر بـۆ بەختیاری!.. دەمێك زێڕ ئەپەرستیّ وا ئەزانیّ بەختیاری لەگەلّ زێڕ پەیدا ئەبیّ! دەمێك لەژیانو خۆشی ژیان دوور ئەکەوێتەوە، لەکونی ژورێکا دەست ئەکا بەخوا پەرستن بۆ ئەوەی رۆژێك بگاتە بەختیاری! دەمێکیش هەرچی ئیشی بیّ پەردەییو سوکی هەیە ئەیکا. شەق لەشەرمەزاریو شورەیی هـەلّ ئـەدا، پیـاوەتیو چاکـەو خۆشەویسـتی، ئەپلیشـێنێتەوە، ئـادەمیزادی هـاو خوێنـی ئـەکوژیّ، هـەر بـۆ بەختیاری! توچیت ئەی بەختیاری کە ئەم هـەموو کارو بارەت بەناوەوە ئەکریّ؟ لەکوێیت ئەم ئادەمیزادە کاولە لەم ماندویتیو بی ئارامیە رسگار کەیت لەکوی‌یێت دوایـی بـەم بێداریـو زۆرداریـە بێنیـت کـە بـەناوی تـۆوە ئـەکرێت؟! لـەکوێیت؟ لەکوێیت!؟..

# ئەوساکە چۆن بویت؟!

هـەرچ ئاگرێك دەستی زۆردار هەلّی ئەگرسـێنیّ، هـەرچ هـەرا یـەك (لـەلای لابەلاوە) بەرپا ئەبیّ، هـەرچ بەلاّیـەك لـە ئاسمان ئەکەوێتە خواریّ، هـەر تـەنیا هەژاری قوڕبەسەر تیا ئەچێتو، هەژاری قوڕ بەسەری تیا سەرگەردان ئەبێت!.. بەلّیّ ، لـە هەموشـتێکا هـەر هـەژاری قوڕبەسـەر بـەش خـوراوو مـالّ وێرانـە، لەهەمو هەرایەکا هەر ئەو نیشانەی تیرهاویژانە..

گرانی ئەبیّ هەر تـەنیا هـەژاری کاول ئەمریّ لەبرسانا؛ چونکە دەوڵەمـەند هەرچی تفاقێك لەبازاڕا هەیە، ئـەیکڕێتو لـەکونی ژوورەوە قایمی ئـەکا، هێشتا لە شەقی گرانی ڕسگاری نـەبووە جـەنگ بەخۆی‌و دیمـەنی سامداریەوە دێتو، قیڕ ! هـەژاری قوڕبەسـەر ئەکـەن بـە باڵبـاز (جنـدی) بـەلاّم دەوڵەمـەند (بەلـەد) ئەداتو وەکو بەرزەکی بانان دەرئەچیّ! ئەگەر خوای کرد و لەشەڕ، ڕسگاری بو، دێتـەوە جوتیاری بکا، کەسـەیر ئـەکا ، دەوڵەمـەند هـەمو زەویـو زارێکـی بەپارەی کەڕواوی کریوە، ئەوسا یان ئەبیّ منـەتو فیزی دەوڵەمـەند هەڵگریو، لەژێر شەقو تێلاّیا بکوتیّ بۆ لەتەنانێك، یان ئەبیّ بمریّ له برسانا.

ئەگـەر بەجوتیاری‌و قوڕ بەسـەری خانوویـەکی دروست کردو ویستی تیـا بحەوێتەوە، گەردون ((لافاویّ)) ئەنێریو هەموو شڕو شیتالّی ئاو ئەیبا، بەلاّم دەوڵەمەند لەخانوی چیمەنتۆ بەند و ئاسـنا پـیّ ئەکـەنێو گاڵتـە بـە (لافـاو) ئەکا...

وەنەبیّ ئەگەر لەوەش ڕستگاری بوو، نەختێك پشوبدا، نەء.. بەڵکو دەمێك نەخۆشی، دەمێك مالّ سوتان، دەمێك... دەمێك، مالّی وێران ئەکاو ناهێلّیّ سەر بەرزکاتەوە یا پەل بهاویّ.. بەلّیّ لەهەمووشتێکا هەر هەژاری قوڕبەسەر مالّ وێرانە: گرانی ئەبیّ هەر ئەو ئەمریّ لەبرسانا، شەڕ ئەبیّ هەر ئەو ئەکەن بە (باڵبان)، ئاگر ئەکەوێتەوە هەر خانوی ئەو ئەسوتیّ، لافاو هەلّ ئەستیّ هەر خانوی ئەو ئاو ئەیبا، نەخۆشی پـەیدا ئـەبیّ هـەر مـالّو منداڵـی ئـەو ئـەبیّ بـەقوربانی، لەگـەلّ ئەوەشـا شـەوو رۆژ تەقـەلا ئـەدا بـۆ ئـەوەی ڕۆژێـك وەکـو ئـادەمیزاد بەبـەختیاری بـژی ، کـەچی دەمێـك دەردو نەخۆشـی، دەمێـك بـیّ دەرامەتیو بیّدەستی، دەمێك بەر بەرەکانی دەوڵەمەند ڕێگەی لیّ ئەبرێتەوە. تۆ بزانە چەند پیاوی هەژار کوڕی زیرەکیان هەیەو ئەیانەوی پیّیان بخوێنن بۆ ئەوەی کاولی بەریان دا، کەچی لەبەر بیّ دەستی پیّیان نـاکریّ؟ یـان ئەگـەر پیّیـان کـراو نایانـە بـەرخوێندن، بزانـە چـەندیان لەبـەر پیسـیو پۆخلیـو نەخۆشی‌و.. لـەنیوەی ڕێگا بەناکامی ئەمرن؟ یـان ئەگـەر نـەمردنو گەیشـتنە ئـەوەی بچنـە قوتابخانەیەکی بەرز، بزانـە: چـەند کـوڕە دەوڵەمـەند بـەخۆیان‌و پشتو (کارتیانـە)وە لەبەردەرگادا وەستاون ڕێگـە لـەکوڕی هـەژاری قور بەسـەر ئەبڕنەوە.

بەلّیّ ئەمە ژیانی هەژاری قوربەسەرە لـەتافی تریفەی روناکی شارستانیو پیش کـەوتنا ئینجا کە لـەم رۆژەدا ئەمە بیّ ژیانی هـەژاری بیّکـەس ، ئـاخۆ ئەوساکە کە زانینـو زوردارییو دەرەبـەگی، لەهەڕەتـەی تـەوژمو تینیـابوە ئـەم کاولانە چۆن بو بێت؟.

گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە (5) سالّی (4) 1943



# کێش

# لەشیعری کوردیدا

ئەحمەد هەردی

ئیمڕۆ لەشیعری کوردیدا، دوو جۆر کێش (وزن) بەرچاو ئەکەوێ: یەکەمیان: کێشی بڕگەیی (مقطع) کەکێشێکی کۆنی نەتەوەیی‌یە، وەلەمەوپێش شاعیرانی لەهجەی گۆران (هەورامی و زەنگەنە) زیاتر بەکاریان هێناوە. جگە لەوەی کەلەناو زۆرترینی سادەو نەخوێندەواری گەلی کوردا، هەموو گۆرانی و بەیت و فۆلکلۆرێك، بەم کێشە ووتراوە. وەلەم دواییەدا، شاعیرە تازەکان زیندویان کردۆتەوەولەسەری ڕۆیشتون.

دووهەمیان: کێشەکانی عەرووزی (عروض) عەرەبیە، کە: (خەلیلی کوڕی ئەحمەدی فەراهیدی) دای هێناوەو، لەڕێی ئەدەبی (فارس)ەوە گەیشتۆتە شاعیرانی کورد بەهۆی ئەوەوە کەزمانی کوردی خزمایەتی‌یەکی نزیکی هەیە لەگەڵ زمانی فارسیدا.

جگە لەوەی کەلەسەردەمی (ئێلخانی)یەکاندا= واتە دوای عەباسییەکان– زمانی فارسی، ماوەیەکی زۆر زمانی ڕەسمی بوە، لەسەراو کۆشکەکاندا.

ئەم کێشەیان ئەو شاعیرانە بەکاری ئەهێنن کە پەیڕەوی شاعیرە کۆنەکانمان ئەکەن. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ، کەنەتەوەی کوردو فارس، بە بێ دەستکاری کردن ئەم کێشانەیان وەرگرتوە.بەڵکو بەپێی سروشتی زمانەکانیان، گەلێ کێشیان فڕێ داوە، وەکو کێشی (وافیرو بەسیت و تەویل و مەدید)، جگە لەوەی دەستکاری گەلێکیان کردووە، ئاهەنگی زمانی خۆیانیان بەسەرا سەپاندوە کەلێرەدا ماوەی باس لێ کردینان نیە.

لەبابەت ئەوەوە کە ناوی (عەروز) لەچیەوە هاتووە، هەر یەکە قسەیەکی لێ ئەکات، هەندێك ئەڵێن: خەلیلی کوڕی ئەحمەد، لەشاری مەککە–کە عەروزی پێ ئەڵێن– ئەم کێشانەی بەبیرا هاتووە، بۆیە ناوی نراوە (عەروز) هەندێکی تریش بەجۆرێکی تر لێکی ئەدەنەوە...هتد

جا، ئەمانە هەرکامێکیان ڕاست بێ‌و، ئەم ناوە. لەهەرچیەکەوە هاتبێ، ئێمە ئەوەندەمان پێویستە کەبزانین عەروز (تەرازویەکە کەشیعری پێ ئەکێشرێ، بۆ ئەوەی کێشی لەنگ و ڕێکی پێ لەیەك جیا بکرێتەوە). (الاقناع فی العروض والقوافی– لاپەڕە –3– صاحب بن عباد–چاپی–1960). جیاوازی نێوانی ئەم دوو کێشە ئەوەیە: کەلەکێشی بڕگەیی‌دا، ژمارەی بڕگە، وەلەکێشی عەروزدا، شوێنی بزوان و نەبزوان (موقع الحرکە والسکون)، بایەخی پێ ئەدرێ. وەکولەمەودا ڕوونی ئەکەینەوە.

## یەکەم کێشی عەروز

### 1–دەربارەی کێشی عەروز

لەپێشەوە ووتمان، لەکێشی عەروزدا، شوێنی بزوان و نەبزوان، بایەخی پێ ئەدرێ. بۆ ئەمەش، با، لەپێشا لەکێشی ووشەوە دەست پێ بکەین. جارێ پێویستە بزانین کە چۆن هەمو (کەل و پەل)ێك کێشانەی هەیە، هەمو ووشەیەکیش کێشێکی تایبەتی هەیە. بۆ دۆزینەوەی ئەو کێشە ئەهێنین ئەو ووشەیە بەرامبەر ووشەیەکی تر ڕائەگرین، بەجۆرێك کە (شوێنی) بزوان و نەبزوانیان، بەتەواوی بەرامبەر بەیەك بێ. لێرەدا پێویستە ئەوە ڕوون بکەینەوە: کە ئەڵێین (شوێنی بزوان و نەبزوان) مەبەستمان تەنیا (ژمارە)ی پیتی بزواوو نەبزاو نیە، چونکە لەعەروزدا، ژمارەی پیتی بزواوو نەبزواو هەرچەندە بەقەد یەك بێ لەهەردوکیانا، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ: کە ئەو دوو ووشەیە لەکێشا وەکو یەکن.

بۆ نمونە ئەگەر ووشەی (مفاعیلن) بەراورد بکەین لەگەڵ ووشەی (مستفعلن)دا ئەبینین لەکێشا وەکو یەك نین، ئەگەر چی (ژمارەی) پیتی بزواوو نەبزواوی هەردووکیان بەقەد یەکە. بۆچی؟ چونکە (شوێنی) بزواوو نەبزواویان بەرامبەر بەیەك نیە.

بۆ ئاسان کردنی باسەکەمان، با هەردوکیان، وەکو لای خوارەوە، بکەین بە سێ کەرتەوە:

| سەرەتا | ناوەڕاست | کۆتایی |
|---|---|---|
| 1–مفا | عی | لن |
| 2–مس | تف | علن |

ئەبینین سەرەتای یەکەمیان (پیتی سێ هەمی) نەبزواوە (ساکن) کەچی سەرەتای دووهەمیان (پیتی دووهەمی) نەبزواوە. کەچی سەرەتای دووهەمیان (پیتی دووهەمی) نەبزواوە. هەروا کۆتایی (یەکەمیان) (پیتی دوهەمی) نەبزواوە. کەچی کۆتایی (دووهەمین) (پیتی سێ هەمی) نەبزواوە. کەواتە (شوێنی) بزوان و نەبزوانیان وەکو یەك نیە، بۆیەکە لەسەر یەك کێش نین. بەپێچەوانەی ئەمەوە، ئەگەر ووشەی (چاوەکانم) بهێنین، وە بەرامبەری پێ بکەین لەگەڵ (فاعلاتن)دا، وەکو لای سەرەوە کردمان ئەبینین:

| سەرەتا | ناوەڕاست | کۆتایی |
|---|---|---|
| 1–چا | وەکا | نم |
| 2–فا | علا | تن |

سەرەتای یەکەمیان (پیتی دوهەمی) نەبزواوە. سەرەتای دوهەمیش وایە. ناوەڕاستی یەکەمیان (پیتی سێ‌هەمی) نەبزواوەو ناوەڕاستی دوهەمی هەروایە. کۆتایی یەکەمیان (پیتی دوهەمی) نەبزواوە، کۆتایی دوهەمیش کتومت وەکو ئەوە. واتە پیتی بزواوو نەبزواوی هەردوکیان، نەك هەر بەقەد یەکە، بەڵکو لەپاش و پێش خستنا (لە تەرتیبا) وەکو یەك وان. بۆیە ئەتوانین بڵێین: هەردوکیان لەکێشا یەك جۆرن.

لەسەر ئەم دەستورە وشەی (نەزانی)لەکێشی وەکو (فعولن)وە (چاوەکانم) وەکو (فاعلاتن)وە (لەپێناوی) وەکو (مفاعیلن) وایە....هتد.

### 2–هەنگاوەکانی عەروز

پێش ئەوەی بێینە سەر کێشی شیعر، با باسێکی هەنگاوەکانی عەروز بکەین.

.. لەپێشەوە ووتمان کە لەکێشی عەروزدا، شوێنی بزوان و نەبزوان بایەخێکی تایبەتی دراوەتێ. لەبەر ئەمە زانایانی (عەروز) هەندێ (تەفعیلە)یان داناوە کەجگە لە پیشاندانی شوێنی بزوان و نەبزوان هیچ مەعنایەکی تریان نیە. واتە هەریەکەیان شوێنی بزوان و نەبزوانیان جیایە لەوی تریان. ئەم (تەفعیلانە)ش کەلەزمانەکانی ڕۆژئاوادا پێ یان ئەڵێن (پێ)وە ئێمە لێرەدا، ناوی (هەنگاو)مان لێ ناوە، هەشتن:

1–فاعلن
2–فعولن
3–مفاعیلن
4–فاعلاتن
5–مستفعلن
6–متفاعلن
7–مفاعلن
8–مفعولات

واتە هەریەکێ لەم هەنگاوانە چەند جارێك دوبارە بکەینەوە، کێشێکی تایبەتی لێ پەیدا ئەبێ وە ئەبێ بە تەرازویەك بۆ کێشانەی هەر شیعرێك کە لەسەر ئەو کێشەی ئەو بێ بۆ نمونە: ئەگەر بڵێن: (فاعلن فاعلن فاعلن فاعلن) جۆرە کێشێك پەیدا ئەبێ کە جیایە لەوی تریان.

(فعولن فعولن فعولن فعولن) چونکەهەریەکەیان بۆ کێشانەی شیعرێك دەست ئەدەن کە لەکێشا وەکو ئەو وابێ.

ئەم کێشانە هەریەکە ناوێك و چەند شێوەیەکیان هەیە کە ئێمە لەم پلەیەدا پێویستمان پێ‌ی نابێ.

ئەم (تەفعیلانە)ش لەیەك گرتنـی (سـەبەب)و (وەتـەد)و (فاصیلـە) پـەیدا بـوون کەهەریەکەیان ئەکرێن بەدوو بەشەوە، وەکو لەخوارەوە باسی ئەکەین:

**یەکەم: سەبەب کە بەدو چەشنە:**

1-سـەبەبی سووك- کەبرگەیـەکی درێـژە- بریتیـە لـە دوو پیـت کـە دەهـەمیان نەبزواوە (ساکن)، وەکو ( فا، عی، لن) لەعەرەبیدا وە (دە، با، وش، کیٚ) لە کوردیدا، کەنیشانەیەکی ئاوای بۆ دائەنرێ: (−)

2-سەبەبیقورس: کەبریتیە لە دو برگەی کورت لەتەنشت یەکەوە. واتە لـەدوو پیتی بزواو پێك هاتوە کە بۆ هـەر یـەکێکیان چەماوەیـەکی ئاوا ( ‿ ) دائەنرێ. وەکو: (لم، لك) لەعەرەبیدا (حەمە، رەمە، عەبە) لەکوردیدا.

**دووهەم: وەتەد کەئەویش دووچەشنە:**

- وەتـەدی مجموع: کە بریتیـە لەسیٚ پیت سیٚهەمیان نـەبزواوە وەکو (علی، علن، فعو) لە عەرەبیدا، وە (لەسەر، کەوا، بچۆ) لەکوردیدا.
- وەتەدی مفروق (بلاو): کە بریتییە لە سیٚ پیت ناوەڕاستەکەیان نەبزواوە. وەکو (قام، این، قبر) لەعەرەبیدا، وە (بازە، تووڕە، بێنە) لە کوردیدا.

سیٚ هەم: فاصلە: ئەویش هەروەها دوو جۆرە:

1-فاصلەی بچوك: کە بریتییە لە چوار پیت چوارەمیان نـەبزواوە وەکـو (متفا، ذ هبت، سنو) لەعەرەبیداو وەکو (ئەگەڕیٚ، ڕەشەبا) لە کوردیدا.

2-فاصلەی گەورە: کەبریتییە لەپێنج پیت پێنجەمیان نەبزواوە وەکو (شجرتن، قاتلهم) لە عەرەبیداو (دەمەوەری، بەرەکەوا) لەکوردیدا.

جا ئەگەر سـەیرێکی ئـەو هەنگاوانـە (تفعیلـە) بکـەین ئـەبینین چـەند سـەبەبو وەتەدێکیان تیایە:

بۆ نمونە (فعولن) بریتییە لـە (فعو) کە وەتـەدێکی مجموعە+ (لن) کەسـەبەبێکی سـووکە+ (علـن) کـە وەتـەدێکی مجموعـە. هـەروەها (متفـاعلن) بریتیـیە لـە (مـت) کەسـەبەبێکی قورسـە+ (فا) کە سـەبەبێکی سووکە+ (علن) کە وەتـەدێکی مجموعـە. ئەشتوانین بڵێین کـە (متفـا) فاصلەیـەی بچوکـە+ (علـن) کەوەتـەدێکی مجموعـە+ علن)کەفاصلەیەی بچووکە، وەیاخود (عل) سەبەبێکی قورسـە+ (تن) کە سـەبەبێکی سـووك،... وە هـەروەها ئـەوانی تریـش ئـەتوانریٚ بـەش بکریـن بەچـەند سـەبەبو وەتەدێکەوە.

3-هەندیٚ زاراوەی تر لەعەروزا

جگە لەو زاراوانەی باسمان کردن هەندێکی تریش هەیە کە زۆرجار بـەر چاومـان ئەکەویٚ بۆیە پێویستە کەمێك باسیان بکەین:

1-بـەیت: بە دوو دێری شـیعر یـان هەڵبەسـت ئـەڵێن کەلـەدوو (مصـراع) پێـك هاتبیٚ، کە بەمصراعی یەکەم یان دێری یەکەم ئەڵێن (صدر)وە بـەدێری دووەم ئەڵێن (عجز).

2-هەر بەیتێك لەچەند هەنگاوێك پێك دیٚ کە هەریەکەیان (جزء)، وە ئێمە پایەی پیٚ ئەڵێین، کە بەیتی وا هەیە دوو هەنگاو یان سیٚ هەنگاو یان زیاتری تیا ئەبیٚ.

3-دوا هـەنگاوی دێـری یەکـەم (واتـە دوا تفعیلـەی صـدر) پـیٚی ئـەوتریٚ (عەروز- عروض)، هەروەها دوا هەنگاوی دێری دووەم (واتە عجز) پێی ئـەڵێن (ضرب). وە هەنگاوەکانی تر ناواخن(حشو) یان پیٚ ئەڵێن.

کەواتە عـەروز لەلایەکەوە بەو تـەرازوە ئـەڵێن کـە شـیعری کێشـی عـەروزی پـیٚ ئەکێشریٚ، وە لەلایەکی تریشـەوە عـەروز بـەدوا هـەنگاوی دێـری یەکـەم ئـەڵێن کـە ماموٚستا (سجادی) ئەمیانی ناو ناوە (داوێن) وە هەتا ناوێکی تری بۆ ئەدۆزرێتەوە ئێمەش ئەم ناوە بەکار ئەهێنین.

بۆ نموونە سەیرێکی ئەم دوو دێرەی حاجی قادری کۆیی بکە.

| | | |
|---|---|---|
| لەمەیدانی | بەهارا شا | رەکەی کۆ |
| مفاعیلن | مفاعیلن | فعولن |
| حشو | | عروض |
| قبەی کشمی | ریدا بر شق | وکو گۆ |
| مفاعیلن | مفاعیلن | فعولن |
| حشو | | ضرب |

ئێستا لێرەدا ئەوەستین بۆ ئەوەی باسی کێشی شیعر بکەین.

## 4-کێشی شیعر لەعەروزدا

پێش ئەوەی بپرسین کێش لـەچی پەیدا ئەبیٚ یـان کێش چییە، با لەخۆمانەوە هەندێك ووشە بخەینە پاڵ یـەك کەشوێنی بزوان‌ونەبزوانیان بەرامبەر بە یەك بێت. واتـە لەکێشا لەیەك بچن. بۆ ئـەم مەبەستە مـن لەخۆمـەوە ووشـەی (لـەدنیادا) هـەڵ ئەبژێرم کە بریتییە لەم چوار برگەیە (لە، دن، یا، دا) کە کتومت وەکو (مفاعیلن) وایە کەئەویش چوار برگەیە (م، فا، عی، لن).

ئێستا با بگـەڕێین بۆ ووشەیەکی تر کەئـەویش چواربرگـەیی بـیٚ وە لەگـەڵ لـە (دنیادا) بگونجیٚ لەرووی ماناوە. بۆ ئەمەش من وای بەباش ئەزانم بڵێم (دڵێکم بـوو) کەبریتییە لـەچوار برگە. ئێستا ئەگـەر بیـان خەینـە پـاڵ یـەك ئەمـەی خوارەوەمـان دەست ئەکەویٚ.

| | |
|---|---|
| لە، دن، یا، دا | د، ڵیٚ، کم، بوو |
| م، فا، عی، لن | م، فا، عی، لن |

گومانی تیانییە لێرەدا مەبەستمان ناوەرۆك نییە بـەڵکو مەبەستمان پێشاندانی ئـەو ئاهەنگەیـە کـە لـەکێش دا هەیـە. جا ئەگـەر بێتوو دوو ووشـەی تـر هـەڵ بژێریـن کەئەوانیش هەریەکەیان بریتییـە لـە چوار برگـە، وە بیـان خەینـە پـاڵ دوانەکـەی تـر ڕەنگە مەبەستەکەمان بدات بەدەستەوە، من بۆ ئەمیش دوو ووشەی ئاسانی تـر هـەڵ ئەبژێرم هەریەکەیان چوار برگە بـیٚو کتومت وەکو دوانەکەی تر وابیٚ وە ئەڵێم (لە باخێکا گوڵێکم بوو) ئێستا کەبیخەینە پاڵ ئـەوی تـر ئـەم کێشـەمان دەست ئەکـەویٚ:
لەدنیادا دڵێکم بوو، لەباخێکا گوڵێکم بوو.

گومانی تیا نییە کە ئەمە دێرێکە واتە دێرێکی تری ماوە کە ببیٚ بەبەیتێك.
بابۆ ئەو دێرەی تریش ئەم مصرەعەی تری (مەحوی) بخوازین:
بەجاریٚ ماڵی وێرانم ئەمیشم چوو ئەویشم چوو
ئێستا با هەردوکیان بکەین بەبەیتێك.
لەدنیادا دڵێکم بوو، لەباخێکا گوڵێکم بوو
بەجاریٚ ماڵی وێرانم ئەمیشم چوو، ئەویشم چوو.

گومانی تیا نییە کە ئەو بەیتەی سەرەوەتان خوێنـدەوە، هەست بەجۆرە ئاوازو ئاهەنگێك ئەکەن کە ئەگەڕێتەوە بۆ کێشی بەیتەکە. جا ئێستا هەندیٚ لەووشەکانی بەیتەکە پاشو پێش بخەین. وەبەپیٚی ئەو گۆڕینە کەمێك ووشەکانی دەست کاری بکەین بەڵام بیٚ ئەوەی ماناکەی بگۆڕین. بزانین ئەو ئاهەنگەی پێشووی ئەمێنیٚ؟. بۆ یەکـەمیان ئـەڵێین (لەهـەموو دنیـادا دڵێـکو لـەناو باخێکـا گوڵێکـم هـەبوو) وە بـۆ دووەمیان ئەڵێین ماڵی وێرانم بەجاریٚ ئەمیشو ئەویشم چوو) یان (ئەمیشو ئەویشم لەدەست چوو) ئایا ئەو ئاهەنگەی پێشوو تیا شك ئەبەن؟

بیٚ گومان هیچ ئاوازو ئاهەنگێکی تیـا شك نـابریٚ. هـۆی ئەمـەش ئەگەڕێتـەوە بۆ ئـەو جـۆری دانـانو ڕێـك خسـتنەی کەلەبەیتەکـەدا هەیـە. واتـە بـە پـاشو پێـش خستنێکی کەمو زۆری ووشەکان ئەو ئاهەنگە وەکو خۆی نامێنیٚ. چونکە جـۆری ڕیزکردنو ڕێكو پێك خستنی دەستێکی گەورەی هەیە لەدروست بوونی ئاهـەنگا. لەبەیتی سەرەوەدا دێری یەکەمی لەچوار برگە پێکهاتووە واتە هەر چواریان بەقـەدەر یـەکن هـەروەها دێـری دووەمیش لـەچوار پایـە دروست بـوە کەهەریەکـەیان بەقـەدەر یەکن. واتە ئەگەر هەنگاوی یەکەمی دێری یەکەم بگرین وە بەراوردی بکەین لەگەڵ هەنگاوی یەکەمی دێری دووەما.

| | |
|---|---|
| لە، دن، یا، دا | بە، جا، ری، ما |
| م، فا، عی، لن | م، فا، عی، لن |

ئەبینین هەردوکیان لەچوار برگەی جیاواز پـەیدابوون (برگـەی یەکـەمیان کورتـەو برگـەکانی تـر درێـژن) وە بەتـەواوی بەقـەدەر یـەکن کـە ئـەم ڕێـكو پێکییـە لەپەخشانەکەدا بـەرچاو ناکەویٚ لەبەرئەوە هەرچەندە لـە نـاوەڕۆكو مانـادا وەکـو یـەکن بەڵام بەیتەکـە ئاهـەنگێکی تیایـە کـە لەپەخشانەکەدا نییـە. جگـە لـەوە لـەو شوێنانەدا کە هـەنگاوەکان کۆتاییـان دیٚ، جـۆرە پشـوودانو وەسـتانێکی سـووك هەیە کە ئێمە لەو شوێنانەدا خەتێکی سەرەو خوارمان کێشاوە

| | | | |
|---|---|---|---|
| لەدنیادا | دڵێکم بوو | لەباخێکا | گوڵێکم بوو |
| مفاعیلن | مفاعیلن | مفاعیلن | مفاعیلن |

هەروەها لەناوەندی هەریەکیٚ لە هەنگاوەکانی دێری دووەمیشا هـەمان پشوودان هەر هەیە.





کەواتە بەپێی قسەکانی پێشوومان ئێستا ئەتوانین بڵێین (کێش) بریتی‌یە لە : (بەش کردنی چەند بڕگەیەکی جیاواز، بەچەند دەستەیەکی چون یەکەوە، کە لەناوەندی هەر دەستەیەکەدا پشوودانێك هەبێ وە وەکو ووتمان عەرەبەکان بەهەر (دەستەیەك) لەمانە ئەڵێن (تفعیلە) کە ئێمە لەکوردی‌دا ناومان نا (هەنگاو).

ئەم تەعریفەی لەسەرەوە کردمان کێشی بڕگەییش ئەگرێتەوە. چونکە کێشی بڕگەییش بریتی‌یە لە (بەش کردنی چەند برگەیەکی جیاواز بە چەند دەستەیەکی چوون یەکەوە، کە لەناوەندی هەر دەستەیەك دا پشوودانێك هەیە)

کەواتە ئەبێ چۆن کێشی عەرووز لەهی پەنجە (بڕگە) جیابکەینەوە؟ ئەگەر سەیرێکی تری بەیتەکەی لەمەو پێش بکەین ئەبینین پایەی یەکەمی دێڕی یەکەم بە وەتەدی مجموع دەست پێ ئەکات (مفا) واتە (سێ پیتەکە سێ هەمیان نەبزواوە)وە ناوەڕاستەکەی سەبەبێکی سووکە (عی) هەروەها کۆتایی یەکەمیش بە سەبەبێکی سووك دێ (لن) واتە بزواوو نەبزواوێك. جا ئەگەر سەیری پایەی یەکەمی مصرەعی دووەم بکەین ئەبینین ئەوانیش هەروان واتە پیتی بزواویان بەرامبەر پیتی بزواو وە نەبزواویان بەرامبەر نەبزواوە تەنانەت هەموو پایەکانی هەروان، وەکو لەخوارەوە ئەی بینین:

لەبا خێ کا بەجا رێ ما

مفا عی لن مفا عی لن

وتد سببی سببی وتد سببی سببی

سووك سووك سووك سووك

واتە هەردوکیان بریتین لەوتدێکی‌مجموع+ سببێکی سووك+ سببێکی سووکی تر کە ئەمە لەکێشی پەنجەدا شك نابرێ. چونکە لەو کێشەدا هەر ئەوەندە بڕگەکان بەژمارە ئەوەندەی یەك بن، ئیتر پێویست بەوە ناکات پیتی بزواوو نەبزواویان بەرامبەر بەیەك بێ وەکو لەمەودوا لێی ئەدوێین.

کەواتە بۆ کێشی عەرووز ئەتوانین بڵێین (کێش بریتی‌یە لە دابەش کردنی چەند بڕگەیەکی جیاواز بەچەند دەستەیەکی چوون یەکەوە کە لەناوەندی هەر دەستەیەکدا پشودانێك هەبێ، بەو مەرجەی شوێنی بزوان‌و نەبزوانی هەر دەستەیەك لە شوێنی بزوان‌و نەبزوانی هەر دەستەیەك لە مەصرەعێکا یان لەبەیتێکا وەکو شوێنی بزوان‌و نەبزوانی هەمان دەستە وابێ لەمەصرەعەکەی تر یان بەیتەکەی تردا بەڵام نابێ بیرمان بچێ کە ئەمە دەستوورێکی گشتی نی‌یە. چونکە جاری واهەیە، بەهۆی زەحافەوە یەکێ لە هەنگاوەکان هەندێ گۆڕانی بەسەرا دێ کە لێرەدا باس کردنی پێویست نی‌یە.

5 –ئەو کێشانەی پتر بەکار هێنراون لەعەروزی کوردی‌دا

بۆ ئەوەی بزانین،شاعیرانی کورد، کام کێشیان پتر بەکار هێناوە، پێویستمان بەوەیە کە (دیوانی) هەموو ئەو شاعیرانە بپشکنین، کەبە کێشی عەروز، شیعریان ووتوە. وەیەك بەیەکی شیعرەکانیان بخوێنینەوەو، بەگوێرەی کێشەکانیان، لێکیان جیا بکەینەوەو بیان ژمێرین، بۆ ئەوەی لەگۆترە، قسە نەکەین. بەڵام داخی گرانم، هەتا ئێستا کەس ئەم هەنگاوەی نەناوە. لەبەر ئەوە– پێشی ئەم هەنگاوە– هەر قسەیەك لەم بارەیەوە بکرێ، گۆترەیەو، لە بۆچوونێکی تێکڕایی، تێپەڕ ناکات.

لەگەڵ ئەوەشا بۆ ئەوەی لەڕاستی لانەدەین‌و چاکەی رۆشن بیرانی لەمەو پێش نەکەین بەژێر لێوەوە. پێویستە دان بەوەدا بنێین کە (شێخ نوری)ی خوا لێ خۆش بوو. چل‌و چوار ساڵ لەمەوبەر. لەرۆژنامەی ژیانی ژمارە –31–ی 1926دا، ووتارێکی لەم بارەیەوە نوسیوە. باسی ئەو (کێش)انەی کردوە کە لەعەروزی کوردی‌دا، پتر شیعریان پێ وتراوە. هەرچەندە ووتارەکەی یەکجار کورتەو ناوی کێشەکانی نەهێناوەو بۆ هەر کێشێ تەنیا یەك نمونەی پیشان داوەو ئەو مەرجەی تیا نیە کەلەپێشەوە باسمان کرد (واتە شتێکی وا پیشان نادات کە دیوانی هەموو شاعیرەکانی پشکنیبێ) لەگەڵ ئەمانەش شێخ نوری– بەپێی بۆچوونی تا ئێستای من– یەکەم کەسە کەلەم باسە دوابێ‌و نوسینەکەی بایەخێکی ئەدەبی‌ی هەبێ. بۆیە ئەتوانین– دوای هەندێ دەست کاری کردن‌و لێ فڕێ دان– ووتارەکەی بکەین بەبنەڕەتێ بۆ باسەکەی ئێستامان. بەڵام نابێ ئەوەمان لەبیر بچێ کە ئەمە، بۆ چوونێکی سەرەتایی‌یەو پێویستی بە پشکنینێکی دوورو درێژە. چونکە شاعیرانی کورد لەکۆنەوە تا ئەمرۆ.گەلێ کێشی عەروزیان بەکارهێناوە. تەنانەت لەسەر کێشی (کامیل)یش، هەڵبەستیان داناوە، ئەگەرچی دوو سێ هەڵبەستیش بێ. ئەوەندە هەیە، بەکارهێنانی کێشەکان بەگوێرەی شاعیرەکان، ئەگۆڕێ، کە هەریەکەیان پێویستی بە جیا کردنەوەو ژماردنێکی وردە. هەر چۆنێ بێت بەپێی بۆچوونێکی سەرەتایی، ئەتوانین بڵێین:

ئەو کێشانەی لە کوردیدا پتر باویان هەیە، ئەمانەن:

یەکەم– ڕەمەل

1 –کێشی ڕەمەلی هەشت هەنگاوی مەحزوف:

(فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن

فاعلاتن فاعلاتن فاعلاتن فاعلن)

ا– تانەگریا ئاسمان‌و تەم وڵاتی دانەگرت

گوڵ چەمەن ئارا نەبوو، هەم لێوی خونچە، وانەبو

ب–وەك مەدینە، بێ نەبی بێ، یا نەجەف بێ، بێ عەلی

شاری غەزنەش، ئێستە بێ مەحمودە، وەك داریکەلی

(حەمدی صاحبقران)

ج–بابەکوڵ بگریم لەگەڵ تۆ هەوری سووری بەهمەنی

من بەوەی گوڵ کەوتە ژێر گڵ، تۆ بەوەی گوڵ پێ کەنیٚ

(پیرەمێرد)

د– بەختەکەم بەدبەخت‌و شومە سەر لە جێگەی پێ ئەنێم،

ئارەزووم ئاوی (حەیاتە) (کانی مانگا) دێتە ڕێم.

(سەلام)

کێشانەکەی:

| | | | |
|---|---|---|---|
| بەختەکەم بێ | بەختو شوومە | لەسەر جێگەی | پێ ئەنێ (م) |
| فاعلاتن | فاعلاتن | فاعلاتن | فاعلن |
| ئارەزووم ئا | وی حەیاتە | کانی مانگا | دێتە ڕێم (م) |
| فاعلاتن | فاعلاتن | فاعلاتن | فاعلن |

دوهەم: هەزەج

1–هەزەجی هەشت هەنگاوی:

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن مفاعیلن

ا– لەکونجی سینە دەنگی ئای‌و ئۆی دڵ دێ بەمەحزونی

وێران بێ نەم دی ساتێ لێی نەیەت ناڵەی بریندارێ

(کوردی)

ب– لەگەڵ دڵ شەرتە ((سالم)) گەر نەجاتم بێ لەتارانا

بەهەشت ئەر بێتە دەشتی ((رەی))، بە ئێرانا گوزەر ناکەم

(سالم)

ج–لەدنیادا نیە وەك من، بەعشقی ئەو گرفتارێ

سەرو ماڵم لەڕێی دانا، کەچی لوتفی نەبوو جارێ.

(بێکەس)

د–لەدولبەر گفتوگۆییێکم نەبیست، ئەی سینە ئەفغانێ

لەلێوی پێ کەنینێکم نەدی، ئەی دیدە گریانێ

(بێخود)

2–هەزەجی شەش هەنگاوی (مەحزوف):

مفاعیلن مفاعیلن فعولن

مفاعبلن مفاعیلن فعولن

ا– وەکو یەك دێتە بەر گوێی پیاوی ئەحمەق

نەفیری بولبول‌و ئاوازی لەق لەق

(سالم)

ب– ئەوا دیسان لە گۆشەی نادیاری

دڵم هەستا، زڕەی زەنگی فگاری

(گۆران)





ج- بەفیدایی شوانتان حاتەمی تەی،

بەقوربانی سەپانتان ئالی بەرمەك

(حاجی قادری کۆیی)

3-هەزەجی هەشت هەنگاوی (ئەحرەبی مەکفوفی مەحزوف):

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن

ا- گریانی منو خەندەیی تۆ ئێستە ئەشوبهێ

بەو موسمی بارانە کەوا خونچە ئەپشکوت

(نالی)

ب- بولبول وەرە تا ڕۆحی منو تۆیە بنالێن

تۆ باغی گوڵانت چوە من داغی دڵانم

(وەفایی)

ج-جانا وەرە ئەم جەژنە بەقوربانی سەرت بم

بۆ تیری قەزا، چاوی حەسودان سوپەرت بم

(کوردی)

د- مەربوتە حەیاتم بە سولەیمانیو خاکی

خۆزگەم بەسەگی قاپیەکەی ئەحمەدی کاکی

(شێخ ڕەزا)

با لێرەدا هەندێ بوەستین بۆ ئەوەی لەبارەی ئەم کێشەوە، هەندێ چەوتی ڕاست بکەینەوە.

مامۆستا سەججادی) لەلاپەرە (125-127)ی (نرخ شناسی)دا ئەم کێشە بەعەروز دانانێ.

هەموو بەڵگەکەشی ئەوەیە کەلە عەرەبیدا چاوی پێی نەکەوتووە. ئێمە لەپێشەوە ووتمان (کێشی عەروز) لەڕێی ئەدەبی فارسیەوە گەیشتۆتە شاعیرانی کورد، هەروەها ووتمان (فارسو کورد) بەپێی سروشتی زمانەکانیان دەست کاری عەروزیان کردوە. جالێرەدا پێویستە بڵێین کە ئەم کێشە پاڵ پشتێکی گەورەیە بۆ ئەم قسەیە. چونکە لە فارسیدا لە زۆر کۆنەوە بەکارهێنراوە. بروانە (لاپەرە 190- المعجم في معايير اشعار العجم- تصحيصي قزويني- مراجعەی- مدرس رضوی- چاپی 1338 شمسی تاران). وە گەورەترین بەڵگە بۆ ئەوەی کە لەسەر کێشی (عەروز) ووتراوە ئەوەیە کە هەموو (تەفعیلە)کانی یەکەمی بە (مفعول) دەست پێ ئەکەن وە (عەروز) وە (زەربی) هەموویان بە (فعولن) یاخود (فعولات) دوایی‌دێت. وە ناوئاخنی هەموو بەیتەکان بریتی‌یە لە دووجار (مفاعیل).

بۆ ڕاستی قسەکەمان- لێرەدا- هەر ئەوەندە ئەتوانین دوو بەیتی‌هەڵبەستەکەی (شێخ ڕەزا)کێشانە بکەین:

مەربوتە حەیاتم بە سلەیمان یوخاکی:

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن

خۆزگەم بە سەگی قاپ یەکەی احمە دی کاکی

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن

بەم حاڵە پەرێشانە وەبازەش هە دوەبل لا

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن

شیعرت ڕەبەنگیزە ڕەزا شاعی ری چاکی

مفعول مفاعیل مفاعیل فعولن

تێ بینی: ئاشکرایە هەر پیتێ (شەددەی) لەسەر بێ بەدوو پیت حساب ئەکرێ (لەعەروزدا کەیەکەمیان (نەبزواوە= ساکن) وە دووهەمیان(بزواوە= متحرك). هەروا ووتمان: ئەگەر دوو پیتی نەبزواو (ساکن) هەمزەی لەپاشەوە بوو، هەمزەکە ئەبێ بەسەر (فتحە) بۆ پیتی پێش خۆی، وەکو لەسەرەوەدا دیمان (باز اشهد باللە) ئەبێ بە (بازەش هەدو بل لا)... هتد وە بۆ ئەوەی قوتابی سەری لێ نەشێوێ، بەپێویستی ئەزانم، بەیتەکەی سەرەوە دووبارە بکەمەوە، کەئەمەیە:

بەم حاڵە پەرێشانەوە باز ئەشهەدو بل لا

شیعرت تەرەب ئەنگێزە (ڕەزا) شاعیری چاکی

4-هەزەجی هەشت هەنگاوی ئەضرەب

مفعول مفاعیلن مفعول مفاعیلن

مفعول مفاعیلن مفعول مفاعیلن

ا- تالاّنی سەرو ماڵم چاوی ڕەشی فەتتانت

پابەندی دڵو دینم کاکۆڵی پەرێشانت

(کوردی)

ب- گەردن کەچی زوڵفی بوی، سا دڵ مەدە بەر مژگان

واخۆت لەتەناف داوە، ئیتر لەقەناڕەت چی

(نالی)

ج- ئەی ساحەتی صەد جەننەت، دەشتی عەرەبستانت،

نایدەم بەهەزار گوڵشەن یەك خاری موغەیلانت

(بێخود)

سێ هەم: مضارع (موزارع)

- موزاریعی ئەحرەبی مەکفوفی مەحزوف

- (هەشت هەنگاوی)

مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن

مفعول فاعلات مفاعیل فاعلن

ا- قوربانی تۆزی ڕێگەتم، ئەی بادی خۆش مرور

وەی پەیکی شارەزا، بەهەموو شاری شارەزوور

(نالی)

ب-جانم فیدایی سروەکەت ئەی بادەکەی سەحەر

وەی پەیکی موستەعیدی هەموو ڕاهی پڕ خەتەر

(سالم)

ج-ئەی چەرخی بەدموعامەلە تاکەی خەتا ئەکەی

ئەم کوردە بێ کەسانە بە غەم ئاشنا ئەکەی

(بێخود)

د-ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە، نەورۆزە هاتەوە

جەژنێکی کۆنی کوردە بەخۆشیو بەهاتەوە

(پیرەمێرد)

لێرەدا وای بەباش ئەزانم کەلەوە زیاتر لەسەری نەڕۆین نەك لەبەرئەوەی هەموو ئەو کێشانەمان باس کردوە کە لەکوردیا باون، بەڵکو لەبەرئەوەی کە قوتابیانی ئەم قۆناغە، لەوەندە زیاتر هەڵناگرن- جگە لەوەی- کەبەلای ئێمەوە- ئەم کێشانەی هەڵمانبژاردن ئاهەنگی موسیقایان زیاتر تیایەو، ڕەنگە بۆ قوتابی ئاسان تر بن، ئەگینا ئەگەر گوێ نەدەینە پلەی تێ گەیشتنی‌قوتابیەکان، ئەبێ نەك هەر هەموو کێشەکانی (شێخ نوری)، بەڵکو گەلێك کێشی تریش بخەینە بەرچاو کە بەلای ئێمەوە، زۆرترینی شاعیرانی کورد لەسەری ڕۆیشتون.

دووهەم: کێشی برگەیی

وەکو لەپێشەوە ووتمان، کێشی برگەیی وە یان کێشی پەنجە، کێشێکی نەتەوەیی کۆنە وەلەمەو پێش شاعیرانی لەهجەی گۆران، زیاتر بەکاریان هێناوە.

هەروەها ووتمان کەلەناو زۆرترینی سادەو نەخوێندەوانی گەلی کورد، هەموو گۆرانیو بەیتو فۆلکلۆرێك، بەم کێشە ووتراوە. وە لەم دوایی‌یەدا شاعیرە تازەکان زیندویان کردۆتەوەو لەسەری ڕۆیشتون. هەروەها لەپێشەوە ووتمان لەکێشی پەنجەدا پێویستە برگەکان بەژمارە ئەوەندەی یەك بن واتە ئەگە هەنگاوێکی (تەفعیلەیەکی) بەیتەکە پێنج برگە بێ، پێوستە هەنگاوەکانی تریش هەر ئەوەندە بن، ئیتر پێویست بەوە ناکات پیتی بزواوو نەبزواویان بەرامبەر بەیەك بێ با سەیرێکی ئەم بەیتەی (مەولەوی) بکەینو بۆ هەر (سەبەبێکی) سووك)خەتێکی ئاوا (-) وە بۆ پیتێکی بزواو چەماوەیەکی ئاوا دانێین (   ).

سەر لەتەرەی خەم خول ئاوردەوە





تای کرژی مەینەت دووباد کردەوە

ئێستا ئەگەر بە پیۆی بڕگەکان ئەم بەیتە دابەش کەین، ئەبینین:

| هەنگاوی یەکەم | هەنگاوی دوهەم |
|---|---|
| سەر لە تە رەی خەم | خول ئا ور دە وە |
| – ◡ ◡ – | – – – |
| 1 2 3 4 5 | 1 2 3 4 5 |

ئەبینین هەر هەنگاویۆ لە پێنج بڕگە پێك هاتووە. جگە لەوە لەڕوی درێژیو کورتی بڕگەکانەوە، هەنگاوی یەکەمیان بڕگەی دوهەمو سیۆ هەمی بڕگەی کورتن، کەچی هەنگاوی دوهەمیان بڕگەی چوارهەمو پێنجەمیان کورتە. بەپێچەوانەی ئەوەوە هەنگاوی دوهەم سیۆ بڕگەی یەکەمیان درێژە، کەچی بڕگەی درێژەکان کە لەهەنگاوی یەکەم دا، دوانیان لەپلەی چوارهەمو پێنجەمدایە، یەکەکەی تریان کەوتۆتە سەرەتاوە.

وە وەکو لەم بەیتەدا دیمان هەر هەنگاوێك بریتیە لە چەند بڕگەیەکی درێژو کورت، بەڵام هەنگاوەکان بەقەد یەکترن.

بۆیەکە لەپێشەوە ووتمان (کێش): بریتیە لە دابەش کردنی چەند بڕگەیەکی جیاواز، بەچەند دەستەیەکی چون یەکەوە، کەلە ناوەندی هەر دەستەیەکدا پشودانێك هەیە)، وەعەرەبەکان بە هەر (دەستەیەك) لەمانە دەڵێن (تەفعیلە) وە ئێمە لە کوردیدا، ناومان ناوە (هەنگاو). ئێستا کاتی ئەوە هاتووە کێشە بڕگەییەکان باس بکەین.

1–کێشی دەبڕگەیی: (دەپەنجەیی)

لەڕاستیدا ئەم کێشە لە هەموو کێشەکانی تر باوترە زۆرترینی گۆرانیو بەیتی کوردی بەم کێشە ووتراوەو شاعیرانی گەورەی وەکو (مەولەوی، ئەحمەد بەگی کۆماسی، وەلی دیۆانە، حەمە ئاغای دەربەند فەقەرە)و گەلێکی تریش ئەم کێشەیان بەکارهێناوە لە سەرتاپای شیعرەکانیاندا. لەبەر ئەوەشە پێشی کێشەکانی ترمان خست.

کێشی دەبڕگەیی (کە ئەبوو ناوی بیست بڕگەیی بوایە) بریتیە لە دوو هەنگاوی پێنج بڕگەیی (5+5)، وەك لەبەیتەکەی مەولەویدا دیمان کە ئەم بەیتانە چاك ترین نمونەن بۆی:

1–سەر لەلەرەی خەم، خول ئاوردەوە
تای کرژی مەینەت دووباد کردەوە

(مەولەوی)

ب– بنوسن بەخوێن جەرگی سەرکردوم
کە من بەتیری دەستی شەم، مردوم

(وەلی دیۆانە)

ج–خانوی بەگزادە لەسای درەختا
ئارامی بووکە، لەکۆشی بەختا

(گۆران)

د–وەختیۆ سارێژ بیۆ، مەر برینەکەم،
سوور بکریۆ بەخوێن رەنگە شینەکەم

(سەلام)

ھ–مەرزی کوردستان، تارو شەوەزەنگ
شاری خامۆشان، بیۆ دەنگ بیۆ ئاهەنگ

(پیرەمێرد)

ە–بێنە چەند ماچیۆ لەسەر خاڵەکەت،
نۆ بەرەی بەری کوڵمە ئاڵەکەت

(ا.ب. هەوری)

ز–تۆ وێڵو ڕەنگ زەرد بەئاسمانەوە،
منیش دەربەدەر بەشارانەوە

(بێکەس)

ح–هەواڵیۆ پرسە لەداریکەلی
شێخ لەویۆ ماوە؟ یا لەسەیوانە؟

(دیلان)

2–کێشی پانزە بڕگەیی (پانزە پەنجەیی)

ئەم کێشە بریتیە لە سیۆ هەنگاو کە هەر هەنگاوێك پێنج بڕگەی تیایە.(لەڕاستیا ئەبوو بەمیش بووترایە سی (30) بڕگەیی چونکە هەر مەسرەعێکی سیۆ هەنگاوە کە بەیتەکە ئەکاتە شەش هەنگاو)

واتە هەمان کێشی دە بڕگەیی پێشوو، ئەگەر پێنج برگەی تری بخرێتە سەر ئەبیۆ بە پانزەبڕگە وەکو ئەم شیعرانەی خوارەوە:

1–دڵە کوورەی خەم، کۆمەڵی زوخاو، سا دەی خرۆشیۆ
موشە دەمەکەی هەناسەی پڕتاو، دەخیلە جۆشیۆ

(سەلام)

ب–ئەی مانگ هاودەردی کۆنی دێرینم، هەوار وێران خۆم،
گوڵە زەردەکەی ئاسمانی شینم، شار پەرێشان خۆم

(دیلان)

ج–سەوزە گیا پاراو، گوڵو گوڵاڵە مەستی رەنگو بۆ
درەخت تازە شین، سەرلق ڕازاوەی گوڵ، گەڵا، چرۆ...

(گۆران)

3 ی‌یەگڕب تشەه یشێک–

ئەم کێشە ئەوەندەی دە بڕگەیی باوی هەیە. بگرە زۆرترینی گۆرانیە خۆشەکانی فۆلکلۆری لەسەر ئەم کێشەن. بۆ وێنە هەر شیعرێك کە لەگەڵ گۆرانی (هەینار هەینار)دا ئەوتریۆ هەشت بڕگەییە وەکو ئەم شیعرەی خوارەوە

کەس نازانیۆ بۆچ بیۆ ڕەنگم
گیرۆدەی دەستی فەرەنگم
بەجیۆ ماوە، شۆخو شەنگم

هەروەها شاعیرەکانی ئەم چەرخە، گەلێك شیعریان لەسەر داناوە کەبریتیە لەدوو هەنگاوی چوار بڕگەیی:

ا–دنیا هەموی چاووڕاوە
فڕو فێڵو بەندو باوە
ڕاستە ڕاستی هەڵگیراوە،
درۆو خۆشە بەلێشاوە

(سەلام)

ب– لەگەنجیما کە ئێستەیە
پڕ لەگۆرانیو بەستەیە
پڕ لە باوەڕی بەتینە
پڕ لەهەوڵو تێکۆشینە

(ع.ح.ب)

ج– باخاوەنم پارەداربیۆ،
یەکەم دەوڵەمەندی شار بیۆ،
بەدەستەڵاتو زۆرداربیۆ،
مادام قەفەس جێگەی منە،
ئەو خاوەنەم لا دوشمنە

(کاکەی فەلاح)

4–کێشی حەوت بڕگەیی

کێشی حەوت بڕگەیی بریتی‌یە لە دوو هەنگاو کە یەکەمیان چوار بڕگەو ئەوی تریان سیۆ بڕگەی تیایە (4+3)

وە لەگۆرانی منداڵانو فۆلکلۆردا بەرگویۆ ئەکەوێت. شاعیرەکانی ئەم چەرخە گەلیۆ شیعریان لەسەر ووتوە:

1– نەسرینە گوڵ، نەسرینە،





چوزەرەی یاسەمینە،
خنجیلە، خوێن شیرینە،
کەیفی لەهەڵپەڕینە،

(پیرەمێرد)

ب– نازانم تۆ چیت ئەی گیان؟
یاری نازداری ژیان

(گۆران)

ج–جەژنی دارو درەختە،
کۆتایی ڕۆژی سەختە
ڕاپەڕە ئیمڕۆ جەختە،
نەمام بنێژە،وەختە

(ا.ب. هەوری)

کێشانەکەی بەم جۆرەیە:

هەنگاوی یەکەم        هەنگاوی دووهەم

نەس ری نە گوڵ        نەس ری نە

–  –  –  –        –  –  –

7 6 5        4 3 2 1

لەراستیا ئەم کێشەش بریتیە لەدوو دێڕ (دوو مەسرەع)، کە هەر دێڕێکیان حەوت بڕگەیە واتە هەمووی چواردە بڕگە ئەکات. بەڵام لەبەر ئەوەی بەحەوت بڕگەیی بەناوبانگە، بۆیەکە پێویست ناکات ناوەکەی بگۆڕین، چونکە ناوی پێشوی– تاڕادەیەك– چەسپیوە.

5–کێشی‌یانزە بڕگەیی

بریتیە لە سێ هەنگاو (4+4+3) کە هەنگاوی یەکەمو دووهەمیان چوار بڕگەو هەنگاوی سێ هەم سێ بڕگەیە. لام وایە– لەناوچەی ئێمەدا —بۆ یەکەم جار (گۆران) شیعری پێ ووتوە:

وەشاعیرە لاوەکان گەلێك هەڵبەستیان لەسەر ئەم کێشە، داناوە:

بەسوڕێکی تر ئەستێرەی ئینسان گر
قەومی کۆنی خستەوە جەژنی ئاگر
کام قەومی کۆن؟ کام جەژنی بەرزو پیرۆز؟
قەومی مادی، جەژنی بڵندی نەورۆز! !

(گۆران)

ب–ئەو کەسانەی چەشەی خوێنی منالن،
بۆ خوێن ڕشتن، وێران کردن،عەودالن،
خوێنی گەشیان، لەناو ئەو باخەدا ڕشت
زەردەخەنەو لایلایەی شرینیان کوشت

(کامەران)

ج– ئەی شەوەکەی بێ تروسکەی دڵ تەنگی!
کوا تریفە زەردەخەنەی هاودەنگی؟

(جمال شارباژێری)

کێشانەکەش:

هەنگاوی یەکەم        هەنگاوی دوهەم        هەنگاوی سێ هەم

کام قەو می کۆن        کام جەژ نی بەر زو        پی رۆز

–  –  –  –        –  –  –  –  –        –  –

11 10        9 8 7 6 5        4 3 2 1

6–کێشی دوانزە بڕگەیی

ئەمیش لەچوار هەنگاو پەیدا بوە (3+3+3+3) واتە لە هەر هەنگاوێکا سێ بڕگەی تیایە. ئەمیش شاعیرە تازەکان شیعریان پێ ووتوە (بەڵام داخەکەم من هەر ئەم دو هەڵبەستەی گۆرانم دەست کەوت کەلەسەر ئەم کێشە بێ) :

ا– قژ کاڵی، لێو ئاڵی، پرشنگی نیگا کاڵ،
ئەی کچە جوانەکەی سەرگۆنا، نەختێ ئاڵ!

(گۆران)

ب– تاهێزی، بزوتن، لە لەشما بەگوڕ بوو،
من کوڕ بوم بۆ ئاغاو ئاغا باوکی کوڕ بوو

کێشانەکەی:

هەنگاوی یەکەم        هەنگاوی دوهەم        هەنگاوی سێ هەم        هەنگاوی چوارەم

تا هێ زی        ب زو تن        لە لەش ما        بە گوڕ بوو

–  –  –        –  –  –        –  –  –        –  –  –

3 2 1        3 2 1        3 2 1        12= 3 2 1

7–کێشی سیانزە بڕگەیی

ئەمیش لەو کێشانەیە کە شاعیرە لاوەکانی ئەم چەرخە زۆری بەکار ئەهێنن. کە بریتیە لە سێ هەنگاو (4+4+3) یەکەمو دوهەم چوار بڕگەن وە هەنگاوی سێ هەم سێ بڕگەیە:

سەردەمێ بوو سەردەمێکی دورو درێژ بوو،
نوێنی ئارام، بۆ من لەسەر، چەرپایەی لێژ بوو

(گۆران)

ب– تادوێنێ بوو، تۆش نێرگزی چەپکی بەهار بووی،
لەباوەشی نەورۆزدا وەك گوڵاڵە، دیار بووی

(شێرکۆ بێکەس)

ج–لەشوێنێکم لەجوانی‌دا ئەڵێی بەهەشتە
هەمو گیانم لێ بۆتە چاو نیازم گەشتە

(کاکەی فەلاح)

د–ئەی شەوەزەنگ، ئەی تاریکی، ئەی ڕەشایی شەو!
دەی باڵی ڕەش، بکەرەوە بۆ چاوی بێ خەو،

(دیلان)

پێش ئەوەی دوایی بەم باسە بێنم، پێویستە ئەوە بڵێم کە ئەم سێ کێشی دواییە–بەلای منەوە– لەپێشا (گۆران) بەکاری هێناون. بەڵام ئەوەی کە نایزانم ئەوەیە کە ئاخۆ دەستکردی خۆیەتی؟ یان وەری گرتوە؟ وە ئەگەر وەری گرتوە تا چ ڕادەیەك دەستکاری خۆیی تیایە؟

جا ئەگەر یەکێك لەم لایەنەوە شارەزایی هەبێ‌و ئەم گرێ‌یەمان بۆ بکاتەوە، بێ گومان، کەلەبەرێکی ئەدەبی کوردیمان بۆ پڕ ئەکاتەوەو مایەی سوپاسە.

---

1– بەلای منەوە ووشەی (بوێژو هەڵبەستو هۆنراوەو وێژە) جێی (شاعیرو شیعرو ئەدەب) ناگرێتەوە. بەڵام بەکارهێنانی (هۆنراوە) یان (هەڵبست) لەباتی(نظم) تارادەیەك ڕێی تێ ئەچێ ئەبێ دان بەوەدا بنێین کەئەم سێ ووشەیە (شاعیرو شیعرو ئەدەب) ئەمەی دواییانی لێ دەرچێ کە کورد بەمەعنایەکی تر بەکاری ئەهێنێ ئەوانی تر هاتونەتە زمانی کوردی‌یەوە کەئەمە دەستورێکە.



# هەردی شاعیر

## بۆ "نوسەری کوردستان" دەدوێ

چەند مەزنە ئەو شاعیرەی لەیەکەمین تەقەللای تاقیکردنەوەی داهێنانێکی تردا، بازنەی شیعری چاولێکەری‌و، یەکتر جوونەوەو باو، جێ دەهێڵی‌و، لەدەرەوەی ئەو بازنەیە بانگەوازی دۆزینەوەی نیشتمانێکی جیاوازو تایبەتمەندرا دێڵێ‌و، نەخشەیەکی تازە ئەخاتە سەر جوگرافیای شیعر

هەردی، لەناوەڕاستی چلەکانی ئەم سەدەیەدا، بەتەنیا لەدەرفەتێکی کورتدا بە هێمنی و ئێجگار بێدەنگی، چەپکە گوڵی خۆی، چەپکە شیعری خۆی، لەگوڵدانی شیعری هاوچەرخی کوردیدا دانا وبۆن بەرامەو تایبەتمەندی دەست نێژی خۆی پێشکەش سەردەمەکەی کرد، کەدڵیانین سەردەمەکانی داهاتووش، دەست‌و دەست‌و پشتاو پشت بۆ یەکتری ئەگوێزنەوە..

هەردی شاعیر، لەوە ناسراوترە-نووسەری کوردستان- پێتان بناسێنێ، چەنکە دەمێکە لەگەڵ (ئەی ڕەقیب-ی دڵدار)و (ئەمڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزەهاتەوەی پیرەمێرد)و شاعیرانی تری وریا کەرەوەدا، کڵپەی (ئازادی خوا)ی لەسنگی ئەم سەردەمە ستەم لێکراوەدا هەڵگیرساندوە، بەچرپەش"ڕازی تەنیایی" خۆی، بۆ هەموو دڵدارانی شیعری ڕەسەن‌و نەمر، درکاندووە.

هەردی شاعیر، دەمێکە لای شاعیرناسان وەرەخنەگرانی شیعری کوردی، ڕازو خواسی پڕ بایەخ‌و گرنگی لەسەر نووسراوە. بەڵام دەمێکە "خۆی" دەربارەی شیعری خۆی نەدواوەو ڕازی دڵە هێمنەکەی بۆ ئاشقانی شیعرو، لاپەڕە تامەزرۆکانی گۆڤارو ڕۆژنامە کوردییەکان نەکردۆتەوە.

بۆیە نووسەری کوردستان، لەرۆژی 1989/11/4دا سەردانێکی تایبەتی هەردی شاعیرو مامۆستاو ڕۆشنبیری کردو ئەم دیدەنیەی بۆ خوێنەرانی گۆڤارەکە لەگەڵدا تۆمار کرد.

**پرسیار /** ئەوتەوژم‌و قوتابخانە شیعریانەی لەسەرەتای تەمەنی شیعریتاندا، کاریان تێکردوون چی‌و چۆن بوون؟.. بەتایبەتیش ئەو قوتابخانە شیعریەی کەبە "ئەدەبی مەهجەری عەرەبی" ناسراوە.

**وەڵام /** ئەگەر ئەو کۆمەڵە شیعرە حساب کەین کەلەساڵانی "1935-136"دا ووتومە واتە کاتێك کە هێشتا لە قوتابخانەی سەرەتاییدا بووم. وەهەندێك لەو شیعرانە بەپێی کات‌و تەمەنی ئەو سام، تاسنورێك بۆ ئەوە ئەشێن کەناوی شیعریان لێ بنرێ، ئەوا ئەتوانم بڵێم: تەمەنی‌شیعری من بەدوو قۆناغی سەرەکیدا تێپەڕیوە.

یەکەم: قۆناغی سەرەتایی: کەلەم سەردەمەدا زۆتر شیعری "نالی"و تێکڕا شیعری شاعیرە کلاسکیەکان کاریان تێ کردووم. هەڵبەت ناشبێ ئەوەشم لەبیر بچێ کەشان بەشانی "نالی" "سالم" و ئەوانی تر، شاعیرانی هاوچەرخی ئەو سەردەمەش کاریان تێ کردووم‌و تاڕادەیەکیش- زۆریان کەم- ڕەنگیان لەشیعرەکانی ئەوسامدا داوەتەوە.

هەرچەندە ئێستا لەو شیعرانە -تاك‌و تەرایەکی لێ دە رچێ- من خۆم هیچی وام لەبیر نەماوە. بەڵام ئەوەی باشە لەکاتی خۆیدا گەلێکیان لای هاوڕێیەکی منداڵیم نووسراونەتەوەو، وەکو خۆی جارێك بۆی باس کردم، بەشێکیان تائێستەش هەر ماون. ئەوەی لەبیرم دێ لەبەشێکی ئەو شیعرانەدا، هەوڵم داوە کەشوێن پێی "نالی"و شاعیرە کلاسکیەکان هەڵگرم. وەلەبەشێکی تریشیاندا کارتێکردنی شاعیرانی ئەو چەرخەوەکو "زێوەر"و "بێکەس"و"پیرەمێرد"و ئەوانی تر، بەئاشکرا دیارە. بۆ نموونە "تەرجیع بەند"ێکم هەیە کەتەنیا بەیتی "تەرجیع"ەکەیم لەبیر ماوە:

ئەسەف بۆ خاکی سۆران‌و شنەی بەیداخی بابانم
لەکوێن کوردی نەوەی کاوەو صلاح الدینی جارانم

لێرەدا شتێکی سەرەکی هەیە نابێ لەبیرم بچێت. ئەویش ئەوەیە کەزۆربەی ئەو شیعرانە کێشی "عەروز" یان تیا بەکارهێنراوە، وەسەیر ئەوەیە لەو کێشە "عەروزیانەدا تاپلەی زۆر سەرکەوتووبووم. بگرە کێشی وایان تیایە کە ئەتوانم بڵێم تاڕادەیەك گرانن‌و شاعیرانی هاوتەمەنی خۆم"وەکو بیزانم" بەکاریان نەهێناوە. لەبیرم دی ساڵێ مامۆستا بێکەسی شاعیر-خوالێی خۆش بێت- قوتابیانی چەمچەماڵی هێنابوو بۆ سلێمانی‌و شەو لە قوتابخانەکەی ئێمە، کەئەوسا "فیصلیە" یان پێ ئەوت، مانەوە ئەوشەوە ئاهەنگێکی شیعریمان گێڕاو من گەلێ شیعری شاعیرانم تیا خوێندەوە. لەپاشدا هەستام شیعرێکی خۆمم خوێندەوە لەنەوعی "تەرجیع بەند" بەرامبەر یەکێك لەقوتابیەکانی چەمچەماڵ کە شیعرێکی لەو نەوعەی خوێندەوە. مامۆستا "بێکەس" بانگی کردم‌و لێی پرسیم ئەم شیعرە چی بوو کەخوێندتەوە؟ ووتم : تەرجیع بەندە لەپاش ئەوەی باسی "تەرجیع بەند" و هەندێك زاراوەی تری لێ پرسیم، ووتی شیعرەکە هی کێ بوو؟ منیش ووتم: هی خۆمە. لەبەر ئەوە داوای لێکردم جارێکی تر بۆی بخوێنمەوە. کەخوێندمەوە، گەلێکی پێ خۆش بوو، وەلێی پرسیم: تۆ ئەم وەزنانە لەکوێوە ئەزانی؟ ووتم هەر بەخوێندنەوە فێر بووم. وەکو ئێستا لەبیرم بێ. ئەو شیعرە"کەئێستا دەقەکەیم لەبیر نەماوە لە(نظیرة)ی تەرجیع بەندەکەی "زێوەر" بوو کە ئەڵێ:

ئەی خونچەی ئومێدی هەموو میللەتی کوردان
بیدارەوە بەوەختی جریدبازی‌و مەیدان...هتد

کە ئێستا ئەزانم ئەوە لەسەر وەزنی "مَفعولُ مَفاعیلُ مفاعیلُ فَعُولُنْ" ە. بەڵام ئەوسا لەم بارەیەوە هیچم نەئەزانی، تەنیا ئەوە نەبێت کەبەحوکمی موتاڵای شیعری زۆر، لەڕێی گوێوە کێشەکانم لێك جیا ئەکردەوە . هەڵبەت لەوە دواش لەسەر ئەم کێشە شیعرم وتووە، تیاشیا سەرکەوتوو بووم. بەبێ ئەوەی هیچ لە زانستی "عەروز" بزانم یا بیستبێتم. واتە من لە تەمەنی (13-14) ساڵی‌یەوە شیعرم ووتووەو تەنانەت هەندێکیان پەسەند کراون کە ئەمە قۆناغی یەکەمە. لێرەدا ئەبێ بڵێم: زۆربەی ئەوانەی باسی شیعری منیان کردووە. ئاگایان لەم قۆناغە نی‌یە.

دووەم: پاش ئەوەی لەقوتابخانەی سەرەتایی دەرچووم، لەگەڵ چەند قوتابیەکی خۆمانا چووین بۆ قوتابخانەی مامۆستایان (دار المعلمین) لە بەغدا. لەوێوە دەستم کردووە بە موتاڵای کتێبی عەرەبی. وەکو لەبیرم بێ، سەرەتا لە (منفلوطی)یەوە دەستم پێکرد کە نووسەرێکی بەناوبانگی میسر بوو، لەپاش کتێبەکانی (منفلوطی) کە ئەوسا زۆر باو بوون، وەکو (نظرات)و(عبرات)و (ماجدلین)و (فی سبیل التاج)و ... هتد، ئینجا چووم بۆ کتێبەکانی (جبران)و شاعیرانی (مهجر). ئەمانە بەشێوەیەکی ئاسان و ڕەوانی ئەوتو ئەیان نووسی، کە بۆ یەکێکی وەکو ئەوسای من، سەرەتایەکی باش بوون،هەڵبەت لەدوای(جبران) زۆرتری نووسینەکانی (میخائیل نعیمە)م لا پەسەند بوو. هەر وەکو تائێستاش هەندێ لەشیعرەکانیم لەبەرە. بەلام وا ئەزانم لە ساڵانی (1938-1939) دا کتێبی (الغربال)یم خوێندەوە، هەروەها لەو دەورەدا ژمارەکانی گۆڤاری (الرسالە)م دەستکەوت کە بەتایبەتی ئەو وتارانەی لە بارەی (ڕەخنەوە) لەو گۆڤارانەدا ئەنوسرا، سەرنجی ڕاکێشام. موتالای ئەمانە، باری سەرنجیان بەرامبەر شیعر گۆڕیم. جگە لەوە ئەو گەرم‌و گوڕی‌و بێ



باكیەی جاران بۆ شیعر هەمبوون نەما. هەڵبەت ئێرە جێگەی ئەوە نی‌یە كە بەدرێژایی ئەم قسانە شی بكەمەوە یا خود ئەندازەی كارتێكردنی ئەو كتێبانە لێرەدا باس بكەم. بەڵام شتی سەرەكی ئەوەیە كە بە تایبەتی نووسینەكانی (جبران) كە بەرگێكی ڕۆمانسی‌ی نوێیان لەبەردابوو بەلای منەوە شتێكی تازەو نەبیستراو بوون، و لەو سەردەمەدا كارێكی زۆیان تێكردم. بێگومان وەكو لە پێشەكی (ڕازی تەنیایی)شدا وتوومە، ئەم قوتابخانە تازەیەی (جبران) یا قوتابخانەی (ڕۆمانسی) بەتێكڕایی، دوو لایەنی جیاوازی تیایە. لایەنێكیان زۆرتر باسی تەنیایی‌و خۆشەویستی‌و فرمێسك‌و خەم‌و پەژارە كردنەو لایەنەكەی تریان یاخی بوون‌و شۆڕش‌و پەلاماردانی باوو نەریتی سەردەمە. نموومەی یەكەمیان وەكو: (الدمعة والابتسامة) و (نحن وانتم). وە نموونەی دووەمیان وەكو (الارواح المتمردە)و (العواصف)و (الاجنحە المتكسرە)و.. هتد. هەرچەندە لەكۆتایی ژیانی (جبران) دا، بیرو ڕای (وحدە الوجود) لەبەرهەمەكانیدا دیارە. كەواتە ئەتوانم بڵێم من هەردوو لایەنەكەی سەردەمێك كاریان تێ كردووم. وە بۆ هەروو لایەنەكە شیعرم هەیە. واتە شیعرم هەیە پڕێتی لە كڕووزانەوەو فرمێسك، شیعریشم هەیە پڕێتی لە شۆڕش‌و پەلاماردان. ئەوەی ڕاستی بێ، ئەگەر چی لەو سەردەمەدا شیعرم داناوە، بەڵام وەكو لەپێشەكی (ڕازی تەنیایی)دا ووتوومە كارتێكردنی ئەم قوتابخانەیە هەتا دەوری (1944)و بەرەو ژوور تریش تینی هەر ماوە. وە ئەو شیعرانەی كە بەرگی حەم‌و پەژارەیان لەبەردایە و لە (1944–1945)و هەتاكو (1950)یش وتوومن. زۆرتری ئەگەڕێنەوە بۆ كارتێكردنی ئەو شیعرانەی (جبران)و هاورێكانی..ڕاستە لەهەمان ساڵانی (1937–1939)، بەهۆی گۆڤاری (المجلە)ی (عبدالحق فاضل)و لەڕێی موتاڵا كردنی هەندێك لە ووتارەكانی‌یەوە، بیروڕای چەپیم بۆ یەكەم جار بەرچاو كەوت، هەر وەكو لەڕێی چیرۆكەكانی (گوركی)یەوە كە هەمان گۆڤار بلاوی ئەكردنەوە، بۆ یەكەم جار ئەدەبی ریالیزمم دی، بەڵام لەبەر ئەوەی كە ئەمانە كەم‌و كورت بوون‌و هیچی وایان بەدوادا نەهات، ئەو بیرو ڕاو ڕێبازە تازەیە نەیتوانی جێگە بە ڕێڕەوی (ڕۆمانسی) لەق بكەن لەلای من.

هەرچەندە ئاشنایەتیم لەگەڵ ڕێڕەوی (ریالیزم) دا ئەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی (1946)و دواتر، بەڵام ئاشنایەتیم لەتەك بیروڕای چەپی‌دا ئەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (1944) واتە پێشتر. ئەمەش شتێكی سەیر نی‌یە، چونكە بارودۆخی سیاسی ئەوسای عێراق، وای كردبوو كە ئەوانەی بیرو ڕایەك بڵاو ئەكەنەوە، لە پلەی یەكەمدا بایەخ بدەن بەشی كردنەوەی لایەنی سیاسی ئەو بیرو باوەڕە، پێش ئەوەی گوێ بدەنە ڕێبازە ئەدەبیەكەی. وە یا ڕەنگە شتیش لەبارەی ئەو ڕێبازەوە نووسرابێ، بەڵام تا ساڵی (1946) نەمدیوە، بەهەر حاڵ من پێش ئەوەی ڕێبازی (ریالیزم) ببینم، قوتابخانەی ڕۆمانسی كاری تێكردبووم.

وەكو لەپێشەكی (ڕازی تەنیایی)شدا ووتوومە. سەیر لەوەدایە هەندێك لەو كەسانەی‌باسی ژیانی منیان كردووە، بە پێچەوانەی ئەم قسانەوە، لایان وایە من لە قوتابخانەی باسی ژیانی منیان كردووە بەپێچەوانەی ئەم قسانەوە، لایان وایە من لە قوتابخانەی ریالیزمەوە چووم بۆ قوتابخانەی ڕۆمانسی، كە ئەمە پێچەوانەی ڕاستی‌یە وەكو باسم كرد، وە تەنها ئەوە ئەسەلمێنێت كە ئەو كەسانە شارەزای ژیانی من نین. لە كۆتاییدا ئەبێ ئەوەش بڵێم كە ئەدەبی (مهجر) هەندێك كاری (سەلبی)شی لەمن كردووە كەلێرەدا جێگای باسكردنی نی‌یە.

**<u>پرسیار</u>/** پرۆسەی خەڵقی شیعر لای شێوە چۆنە؟.. ئایا بەر لەنووسینی پارچە شیعرێک پرۆژەیەکتان بۆ نووسینی هەیە، یان هەر شیعرەو جۆرە (حال) لێهاتنێک دەیخولقێنێ، یان شێوەی لەدایک بوونی تری هەیە؟

**<u>وەڵام</u> :** بێگومان ڕەنگە هەر شاعیرە بەشێوەی جیاوازی شیعر دابنێ، بەڵام ئەوەی كە پەیوەندی بە ئەزموونی تایبەتی خۆمەوە هەبێ ئەوەیە كە هەر شیعرێك جۆرە حاڵەتێكی تایبەتی هەیە. بۆ نموونە جاری وابووە ویستوومە شیعرێك بڵێم كە (فكرە)كەی لەوە پێش لەئەنجامی (مطالعە) یان گفتوگۆ كردندا وەرم گرتووەو پاشان بڕیارم داوە شیعرێك لەسەر ئەو (فكرە) یە دابنێم. تەنانەت هەندێ ماددەشم بۆ ئامادەكردووەو چەند ڕۆژێك گینگڵم پێوە خواردووە. تا لەئەنجامدا چۆتە قاڵبێكی تایبەتیەوە. جاری وایش بووە حاڵەتێكی دەروونی یا كارتێكردنی ڕووداوێكی ناخۆش كە بووە بە هۆی پەژارەیەكی دەروونی، دەستی پێ داومەتە قەڵەم‌و ئەوەشدا خۆی بەڕەوانی هاتۆتە سەر قەڵەم. بگرە هەندێك جار بەجۆرێك ئەو حاڵەتەم دەربڕیوە كە لەوە پێش هەرگیز بەبیرمدا نەهاتووە، بێگومان ئەم حاڵەتانەی دوایی هەموو كاتێك دروست نابن.. بەڵام ئەگەر بۆ بزواندن و هەوێنی شیعرو سەرچاوەی ئیلهام بگەڕێین، ئەوە باسێكە جێگەی نابێتەوە.

**<u>پرسیار</u>/** شیعر هەم موعاناتی شاعیرو هەم توانست‌و ئامادەگی دەیخولقێنێ، ئێوە هەندی شیعر كەلە (1946)دا بەتەواو نەكراوی جێتان هێشتوون لە (1983)دا تەواوتان كردوون.. دیارە ئەمە تایبەتمەندی‌یەكی ئەزموونی شیعرتانە بۆیە ئەگەر سەبارەت بەو ئەزموونە شتێكمان بۆ ڕوون كەنەوە. سوپاستان دەكەین.

**<u>وەڵام</u>:** پێشەكی ئەبێ بڵێم ئەمە شتێكی غەریب‌و تازە نیە لە جیهانی ئەدەبدا، وەكو هەندێ كەس تێی گەیشتوون. بۆ نموونە (ووردز وورث–Words Worth )ی ئینگلیزی كە شاعیرێكی ڕۆمانسی‌یە، شیعری (القبرة– كلاوكورە)ی پاش نزیكەی بیست (20) ساڵ تەواو كردووە. تەنانەت ئەگەر ئەم شێوازە لەهیچ ئەدەبێكی جیهانیشدا نەبێ نابێت بەنەنگەیەك چونكە جیهانی شیعر گەلێك فراوانترە لەوەی كە قالبێكی تایبەتی بۆ دابنرێت. هەروەها ئەو قسەیەش ڕاست نی‌یە كە ئەڵێ: گوایا شیعرێك كە ماوەیەكی زۆری بەسەردا تێپەڕی‌و تەواو نەكرێ، یا لە كاتی خۆیدا نەووترێ، بایەخێكی نی‌یە چونكە ئەم قسەیە تەنها بۆ ئەو جۆرە شیعرە ڕاستە كە پێی ئەووترێ شیعری بۆنە (مناسبات)، وەكە (موناسەبە) كەی بەسەر چوو، نەك تەواو كردنی بەڵكو شیعرەكە خۆیشی لەڕووی مێژوویی‌یەوە، نرخێكی ئەوتۆی نامێنێ بەپێچەوانەی ئەمەوە، ئەو شیعرانەی كە وێنەی تەجروبەیەكی زیندوو ئەكێشن (وەكو تەجروبەیەكی عاتیفی یا فیكری وەیا هی تر)، لە هەر كاتێكدا بووترێ یان تەواو بكرێ، بایەخی تایبەتی خۆی هەیە، بۆ نمونە (بۆدلێر)ی فەرەنسی بەشی زۆری شیعرەكانی لەئەزموون‌و تاقیكردنەوەكانی منداڵی‌یەوە هەڵهێنجاوەو هیچ ڕەخنەگرێكیش ئەمەی لێ نەكردووە بەعەیب. بەپێچەوانەوە ئەم جۆرە شیعرانە ئەوە دەرئەخەن كە شاعیر (ذاكرە)یەكی زیندووی هەیە كە ئەم جۆرە تەجروبانەی تیا ئەمێنێتەوە، وە ئەتوانێ لەهەر كاتێكدا بیێ هێنێتەوە یاد، وە هەمان هەژان‌و (انفعال) لە شاعیرەكەدا دروووست بكات‌و ببێت بە هەوێنی شیعر. هەر كەسێ بیەوێ چاتر لەم باسە تێ بگات، ئەتوانی بگەڕێتەوە بۆ كتێب (النقد الادبی الحدیث) نووسینی (د.محمد غنیمی هلال) هەروەها بەپێی بیردۆزەكانی (علم النفس)یش هەندێك جار ڕەنگی دیمەنێك یا تەنانەت بۆنێكی خۆش، بۆی هەیە ڕووداوێكی لەوە پێشتر بیری شاعیرێك بخاتەوە وبی جولێنێت وە شیعرێكی باشی پێ بڵێت.

بە نیسبەت شیعری (دوو چەشن دڵداری) و (ست فاتمە)وە، لە پێشەكی (ڕازی تەنیایی)دا، بەشێوەیەكی سەرپێیی ئیشارەتم بۆ هەندێ مشتومڕو (مناقشە)ی ئەوسا كردووە. بەڵام لەوە ئەچێ زۆربەی خوێندەواران تێی نەگەیشتبن. بۆیە لێرەدا حەز ئەكەم كەمێك بەدرێژی لەسەری بڕۆم: ئەو سەردەمە چەند برادەرێكی خۆم كە (وەكو ئەوسای من بیروباوەڕی چەپی‌یان هەبوو) لایان وابوو كە شیعرێك پەلاماری چینە باڵاكان و ئیستعمار نەداو پڕ نەبێ لە دروشمی زەق، بەكەڵكی هیچ نایە. وە لەبەر ئەوەی شیعری دڵداری ماوەی ئەم شتانەی تێدا نیە، نابێ شاعیرێكی پێشكەوتنخواز بیڵێت تەنانەت یەكێكیان ئەیوت: گوایا (ستالین) بۆ شاعیرێكی لەو چەشنەی نووسیبوو كە دوو (نوسخە) لە دیوانەكەی بۆ چاپ بكەن! نوسخەیەكیان بۆ خۆی، ئەوی تریان بۆ خۆشەویستەكەی!.. بەڵام من باوەڕم وابوو مەرج نیە شیعر هەر ڕاستەوخۆ پەلاماری چینە باڵاكان بدات. بەڵكو زۆرجار شاعیر ئەتوانێ لە ناواخنی شیعرێكی ویژدانی و عاتیفی‌دا، زۆر چاكتر لە شیعری ڕاستەوخۆ،









شۆڕشی نائومێدی

بارودۆخی کۆمەڵایەتی بخاتە روو. بە مەرجێك ئەو بیروڕایانە بە جۆرێك نەبێ کە لەگەڵ زەمینەی شیعرەکەدا ناساز بێت. ئەبێ ئەوەش بڵێم کە ئەم بۆچوونە وەنەبێ شتێکی تازە داهاتووبێ یان بڵێم دژی بیروڕای (چەپی) بێت، بەڵکو شتێك بوو کە لەگەڵ بیروڕای (چەپیش)دا ئەگونجا. بۆ نموونە لەو کاتەدا گۆڤاری (الغد) هەبوو کە هی (عصبە التحرر الوطنی) بوو لە فلسطین کە وا بزانم سالأنی (1946) ئەهاتە عێراق وەهی (شیوعی)یەکانی (فلسطین) بوو، وە من هەموو ژمارەکانیم ئەخوێندەوەو موتابەعەم ئەکرد. لەو گۆڤارەدا (مخلص عمرو) کە نووسەرێکی بەدەسەڵات بوو، زنجیرەیەك وتاری ئەنووسی لەژێر ناونیشانی (الادب الحی)دا. لە یەکێك لەو وتارانە، باسی شاعیرێکی بەغدادی ئەکات کە بە (ابو زریق البغدادی) بەناوبانگە و لە سەردەمی عەباسی‌یەکاندا ژیاوە. ئەم شاعیرە لە بەغداوە ئەچێ بۆ (اندلس) بۆ لای ئەمیرێکی ئەوێ و قەسیدەیەکی مەدحی بۆ ئەبات بەڵکو خەڵاتێکی باشی بداتێ ئەمیش بەو پارەیە دەسگیرانەکەی بهێنێت کە لە (بەغدا) بەجێی هێشتووە، بەڵام کە ئەچێتە ئەوێ و قەسیدەکەی بۆ ئەمیرەکە ئەخوێنێتەوە، ئەمیرەکە بە تەوسەوە پێی ئەڵێت: جا تۆ لە (بەغدا)وە ئەم هەموو رێگایەت بڕیوە بۆ ئەم شیعرە؟ ئەویش زۆر دڵگران ئەبێ و بە داخێکی زۆرەوە ئەگەڕێتەوە بۆ خانەکەی. بۆ بەیانی، ئەمیر (حاحب)ەکەی ئەنێرێ بە دوایدا، کە تەماشا ئەکەن مردووە، باخەڵی ئەگەڕێن هیچی تیا نادۆزنەوە قەسیدەیەك نەبێت کە تیایدا رووی دەمی ئەکاتە خۆشەویستەکەی و ئەڵێ:

لاتعذليهِ فأن العذل يودعه
قد قلت حقا ولكن ليس يسمعه
استودع الله في بغداد لي قمرا
بالكرخ من فلك الازرار مطلعه
ودعته وبودي لويودعني
صفوا الحياة واني لااودعه
وكم تشفع بي يوم الرحيل منى
وأدمعى مستهلات وادمعه
هەتا ئەگاتە ئەوەی کە ئەڵێ:
و "للضرورة حال لاتشفعه"

واتە: تۆ راستت کرد کە وتت مەچۆ بۆ ئەو وڵاتە دوورە، چەند جار لە رۆژ جیابوونەوەدا بەسەرما گریایت و من بەقسەم نەکردیت.. وە لە کۆتاییدا ئەڵێت: گلەییم لێ مەکە چونکە ژیان هەندێك جار پیاو ناچار ئەکات. بەهەر حال "مخلص عمرو" سەرتاپای ئەو قەسیدەیە شی‌ئەکاتەوە، وە لەسەر مەصرەعی "وللضروره حال لاتشفعه" گەلێك ئەدوێ لە ئەنجامدا ئەڵێت: ئەم قەسیدەیە هەرچەندە باسی ژیانی تایبەتی شاعیرەکەو خۆشەویستەکەی ئەکات، بەڵام لە هەموو شیعرە سیاسی و نووسینەکانی ئەو سەردەمە چاکتر وەسفی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و چینایەتی ئەو سەردەمە ئەکات، بگرە بە جۆرێکی وا دڵگیرانە. بۆیە وەکو لە پێشەکی "رازی تەنیایی"دا وتوومە. منیش ویستم ئەو قسەیە بسەلمێنم وە هەردوو شیعری "دوو چەشن دڵداری" و "ست فاتمە" بۆ ئەو مەبەستە دانراون.

**پرسیار/** لە خوێندنەوەی پێشەکی چاپی دووەمی "رازی تەنیایی"دا ئەوە دەردەکەوێ کە خوێندنەوەو موتاڵاکردنی بابەتی غەیرە شیعری لە چەشنی سیاسی و فەلسەفیو مێژوویی.. هتد بەهۆی سەرەکی بزانن لە وازهێنانتان لە شیعر.. کەچی شاعیر ئیمرۆ بۆخۆپێگەیاندن و خوپەروەردەکردن و بەرزبوونەوەی ئاستی هونەری و قووڵی دەربڕینی شیعریان، پێویستیان بەو جۆرە خوێندنەوانە هەیە ئێوە چۆن سەیری ئەم مەسەلەیە ئەکەن؟

**وەڵام:** با لەبەشی دووەمی پرسیارەکەتانەوە دەست پێ بکەین. ئێوە ئەفەرموون شاعیری ئەم چەرخە، بەو جۆرە نووسین و موتاڵاکردنە خۆی دەوڵەمەند ئەکاو بگرە وای لێ ئەکات کە شیعرەکانی دەوڵەمەندترو بەپێزتر بێت لە هەموو روویەکەوە، ئەم بۆچوونە تەنها لە یەك حاڵدا راستە. ئەویش ئەوەیە کە مادەی ئەم جۆرە موتاڵاکردنانە "کە زۆرتری مادەیەکی زانستیانەیە"، ئەوەندە نەبێ کە "ئاسۆی حەیاڵ"ی شاعیرەکە تەسك بکاتەوە،

وەیا ڕێگەی موتالاکردنی شیعرو دیوانی شاعیرە گەورەکانی لێ بگرێت، چونکە وەکو "گۆران" ئەڵێ، شیعری چاك لە ئاسۆی خەیاڵێکی فراوانەوە دەردەچێت، ئەگینا پێوانەی ئەمە، لە سەدا سەد وا لە شاعیر ئەکات کە شیعرەکانی زۆرتر لە ڕێکخستن (نظم) بچێت، وە پڕی بێ لە مەعلوماتی چەور، بەڵام دوور بێت لە خەیاڵێکی فراوان و عاتیفەیەکی گەرم، ئاشکرایە ئەم جۆرە شیعرەش ڕەنگە لە ڕووی داڕشتن و مەعناوە تەواوبێ، بەڵام شیعرێکی بێ گیانی لێ دەرئەچێ کە زۆرتر لە مەعلومات فرۆشتنەوە نزیك ئەبێ، ئەمەی کە وتم بەشێوەیەکی گشتی کارتێکردنی موتالای ئەو جۆرە بابەتانە دروستی ئەکا.. ئەگینا ئەگەر بێینە سەر ڕوونکردنەوەی یەك بەیەکی ئەم حاڵەتانە، ئەبینین ئەوانەی ئەو جۆرە نووسینانە ئەخوێننەوە، هەموویان لەیەك ئاستدا نین. ڕەنگە یەکێك خۆی لە بنەڕەتدا ئاسۆی خەیاڵی زۆرفراون نەبێت. جگە لەوە وا دەرئەکەوێ ئێوە ئەوەتان لەبیر ئەچێ کە من لە منداڵیەوە شیعرم وتووە، وە کاتێك کە چوومەتە بەغدا، هێشتا لە سەرەتای تەمەنی هەرزەکاریدا بووم. واتە بەهرەی شیعر لای من ئەو ڕەگە دوورو درێژەی نەبووە. جا ئەگەر چاوێ بە بارودۆخی ئەو زەمانەی ئێمەدا بگێڕن، ئەبینین ڕۆشنبیری ئەوسا تەنها بریتی بوو لە شیعرو چەند دیوانێکی شیعری (نالی، (سالم)، (کوردی)، (مەحوی)، (حاجی قادر)، حەریق).. لەگەڵ چەند کەشکۆڵێکی "نجم الدین مەلا".. بەڵام پەخشان و وتاری ڕەخنەو شیکردنەوەو لێکدانەوە نەبوو. بۆیە شتێکی سەیر نیە کاتێ کە چوومە بەغداو ئەو هەموو کتێب و گۆڤارو سەرچاوانەم دی کە لە کتێبخانەی "دار المعلمین"دا هەبوون. تێگەیشتم کە شیعر تاکە وەسیلەی دەربڕینی هەست و بیروباوەڕ نیە. ئەمە قۆناغی یەکەمی دوورکەوتنەوەیە لە شیعر، هەروەها خوێندنەوەی ڕەخنەی شیعریش وەکو لەمەوپێش باسم کرد، وای لێ کردم کە ئەو گەرم و گوڕی و بێ باکیەی جارانم نەمێنێ‌و بە "حذر"ەوە ڕووبکەمە شیعر، ئەمانە بۆ ماوەیەك ساردیان کردمەوە. ئەوەتا وەکو لە پێشەکی "ڕازی تەنیایی"شدا وتوومە، لە ماوەی نێوان "1939–1944"دا تەنها یەك دوو شیعرم نووسیوە، ئەمە لە کاتێکدایە کە لە قۆناغی یەکەمی تەمەنی شیعریمدا، ڕووی داوە لە یەك حەفتەدا زیاتر لە دوو شیعرم نووسیبێ. لێرەدا ئەبێ ئەوەش بڵێم ئەگەر ئەمانە تەنها ڕێگربوونایە لەبەردەممدا، ڕەنگە پاش ماوەیەك بەسەریاندا زاڵ ئەبووم و سوودیشم لەم خوێندنەوانەم وەرئەگرت بۆیە پێزکردنی شیعرەکانم، بەڵام ئەوەی کە هۆی سەرەکی و بنەڕەتیەو کاتی خۆی بواری ئەوەم نەبو لە "ڕازی تەنیایی"دا باسی بکەم. ئەگەڕێتەوە بۆ پاشتر. واتە ئەو کاتەی کە بە خوێندنەوەو تەجروبەی تایبەتی خۆم گەیشتمە هەندێك "قەناعەت" و بیروباوەڕکە جیاواز بوون لەگەڵ ئەو بیروباوەڕو ڕێڕەوانەدا کە ئەوسا باو بوون، وە هاتمە سەر ئەوەی هەوڵ بدەم بیان نووسم و پیادەیان بکەم، کە ئەمە لە (1951)ەوە دەستی پێ کردووە.. دیارە جست و جوو گەران و گفتوگۆو وەڵام دانەوەی ڕەخنە.. سەریان قاڵ کردم و بە تەواوی لە شیعر دووریان خستمەوە، چونکە ئەم جۆرە کارانە بە شیعر جێبەجێ ناکرێن. هەروەها ئەگەر شیعر ئەو جۆرە بابەتانەی گرتە خۆی وەکو (الفیە)ی (ابن ملك)ی لێ دێت و نرخە هونەرییەکەی لە دەست ئەدات. دیارە ئەمە مانای ئەوە نیە کە بەتەواوی لە ئەدەب دوور کەوتوومەتەوە. بەڵکو ئەوەندەی بوارم بووبێت کارم بۆ کردووە وەکو لەو (دراسە)یەدا دەرئەکەوێ کە لەسەر عەروز لە شیعری کوردیدا هەمەو تا ئێستا بڵاونەکراوەتەوە. وەکو ئاشکرایە ئەمەیان زیاتر بریتیە لە شیکردنەوەو لێکۆڵینەوەی زانستیانەی شیعری کوردی لە ڕووی (وەزن)ەوە، هەرچەندە هەمیشە بەهۆی کاروباری ترەوە بەشێوەیەکی پچڕپچڕ نەبێت بواری ئەوەم نەبووە ئیشی بۆ بکەم. وە گەلێك جار بەهۆی سەرقاڵ بوون بە ئیشی سیاسیەوە یاخود هاتنەناو شۆڕش و دەربەدەریەوە دەستم لەو پرۆژەیە هەڵگرتووە، بۆیە تەواوبوونی گەلێك دواکەوتووە تا ئێستاش بڵاونەکراوەتەوە.

لە کاتێکدا کە سەرەتای دەست پێکردنی ئەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی ساڵانی (1960). لە هەموو ئەمانەش بگەڕێتەوە، ئەمە شتێکی ئاساییە کە ئەدیبێك سەرەتا شیعری نووسیبێت و پاشان بەهۆی بابەتی ترەوە لێی دوور کەوتبێتەوەو وازی هێنابێت، ئەدەبی جیهانی و تەنانەت کوردیش پڕن لە نموونەی ئەم حاڵەتە.

<u>پرسیار/</u> ئێوە دەڵێن (شیکردنەوەیەکی سەرکەوتووانە، یان لێکۆڵینەوەیەکی باش لای من هەزار شیعر دێنێ..) ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە شیعر بایەخی نەمابێ یان شتی تر دەگەیەنێ؟

<u>وەڵام:</u> ئەم پرسیارە دوو تێبینی بەدوای خۆیدا ڕائەکێشێ، من لە پێشەکی (ڕازی تەنیایی)دا وتوومە: لەم قۆناغەدا.. شیعری لوتکەکان و چەند کاتێکی تایبەتی لێ دەرچێت، شیکردنەوەیەکی سەرکەوتووانە یان لێکۆڵینەوەیەکی باش بەلای منەوە هەزار شیعر دێنێ.. هتد. کەواتە من بە شێوەیەکی بێ قەیدو شەرت نەم وتووە، کە هیچ شیعرێك بەلای منەوە نیە. بەڵکو وتوومە چەند کاتێك و شیعری لووتکەکانی لێ دەرچێ، کە دیارە ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێ کە هەر شیعرێکی باش بایەخ و جێگەی خۆی هەیە لای من، دووەم–بەشی دووەمی پرسیارەکە ڕووناك نیە. یان شتی تر دەگەیەنێ شیعر بایەخی نەمابێ لای کێ؟ لای من؟ یا چی؟.. هەروەها (یا شتی تر دەگەیەنێ) مانای، چی وەکو چی؟ بە نیسبەت کێوە؟ بەهەرحاڵ، با بێینە سەر وەڵامی ڕاستەقینەی پرسیارەکە، من، وەکو لە وەڵامی پرسیاری پێشوودا وتم، لە ساڵی (1951) بە دواوە کەوتبوومە پشکین و موتالایەکی سەرومڕ، وە لە ئەنجامی ئەوانەدا گەیشتبوومە چەند قەناعەتێکی تازە کە پێچەوانەی بیروڕاو بۆچوونەکانی ئەوساکە بوون. ئەمەش وەکو باسم کرد، وای لێ کردبووم هەوڵ بدەم بۆ بڵاوکردنەوەو پیادەکردنیان. جا لەسەر گەرمی حاڵێکی وادا، دیارە شیکردنەوەیەکی سەرکەتووانە کە ئەو بیروباوەڕە لەهەر سووچێکەوە ڕووناك تر بکاتەوە، یا بەهێزتری بکات، یا حۆراکێکی تازە یا بەڵگەیەکی نوێ بداتە دەستی ئەو بیروباوەڕە، بەلای منەوە ئێستاش هەزار شیعر دێنێ. ئاشکرایە کە لە پێشەکی (ڕازی تەنیایی)دا نەمتوانیوە ئەم جۆرە شیکردنەوەو لێکۆڵینەوانە (تەحدید) بکەم. چونکە وەکو خۆتان ئەیزانن، بارودۆخی ئەوێ ڕێگەی ئەوەی نەئەدا کە من بە (صراحت) ئەو قسانە بکەم. بۆیە ناچار بووم بە شێوەیەکی گشتی باسی بکەم کە ئینسانی ڕۆشنبیر ئەبێ تێی بگات.

*   *   *

<u>پرسیار/</u> تا ئێستا هەر ڕەخنەگر شوێن و پایەی شیعری شاعیری لەناو بزووتنەوەی شیعری سەردەمدا دەست نیشان کردووە، ئێوە ئەگەر خۆتان لە جێی ئەو ڕەخنەگرە بن، شوێن و پایەی شیعری خۆتان لە شیعری کوردیدا چۆن دەبینین؟ لە کاتێکدا کە گۆران وتوویە (هەردی قوتابخانەیەکی تایبەتیە لە شیعری کوردیدا).

<u>وەڵام:</u> من ناتوانم ئەوە بکەم. چونکە ئینسان هەرچەندە هەوڵ بدات و بیەوێت ناتوانێت لە (زاتیەت)ی خۆی ڕزگاری بێت وەکو ئینسانێکی (مجرد) حوکم بدات. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر وەکو ڕەخنەگرێك سەیری شیعرەکانی خۆم بکەم، ڕەنگە لە چەند شوێنێکدا دەستکاری بکەم و لێی ڕازی نەبم، هەروەکو لەیەك دوو شوێندا چەند شتێکی ورد شك ئەبەم کە تا ئێستا هیچ ڕەخنەگرێك بیری بۆی نەچووە کە ئێرە جێی باسکردنی نیە. (گۆران)یش کە وتوویەتی (قوتابخانە) مەبەستی ئەوە نەبووە کە شتێکی تایبەتی و بێ وێنەیە. بەڵکو کە ئەوترێت (قوتابخانە) مانای ئەوەیە شاعیرێکە کە (ئوسلب؟ و (شخصیە)ی لە شیعرەکانیدا دیارەو ڕەخەگر بەبێ ئەوەی پێی بڵێن ئەی





ناسێتەوە. بۆ نموونە رەنگە تا ئێستاش کەس نەزانێ کە شیعری (بۆ مامۆستا بێکەس) کە کاتی خۆی لە (گەلاوێژ)دا بلاوکراوەتەوە، هی مامۆستا (برایم ئەحمەد)ە.. بەلام من هەر کە خوێندوومەتەوە زانیومە هی ئەوەو بەخۆشیم گوتووە. شیعرەکە ئەڵێت:

ئێستەی تەماوی و لەمەو پاشی تار
باڵ ئەگرن بەجووت بۆ کۆی یادگار
ئەگەرێن بەناو هەردو شاخانا
وەك بولبول بەسەر لقی چڵانا
هەردە کش و مات چیا گشت خامۆش
گوڵ داخدارو خونچە خەزان پۆش
هەوارگە چۆڵ و هۆڵ وەك قەبرسان
گیان پەك کەوتە، دڵ دەستەوسان
ئەگەڕێنەوە کەلاوەکەی لەش
لە شادی و هیواو لە ئارام بێ بەش

دیارە ئەمەش مانای ئەوەیە کە جۆری هەڵبژاردنی وشەکان و شێوازی هەر شاعیرێکی باش، لە هەموو شیعرەکانیا دەرئەکەوێ، وە بۆیە هەر بە خوێندنەوەی شیعرەکەدا شاعیرەکە ئەناسرێتەوە. ئەمەیە قوتابخانە. جێگەی خۆیەتی لێرەدا ئەوە بڵێین کە (مامۆستا برایم) لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو شاعیرە چاکەیە، ئەبینین زۆر دەمێکە لە شیعر دوور کەوتۆتەوەو وازی لێ هێناوە. کەسیش گلەیی لێ ناکات.

**پرسیار/** ئەگەر تەمەن گەرابایەوە بۆ سەرەتای لاوی و سەرەتای دەست پێکردنی شیعر نووسین، چۆنتان مامەڵە لەگەڵ شیعردا دەکرد؟.. لێرەوە چ بەو شاعیرانە دەڵێن کە لە سەرەتای دەستپێکردنی شیعریدان؟

**وەلام:** ئەوەی راستی بێت ئەگەر بیرکردنەوەی ئێستام هەبوایە رووم نەئەگردە شیعر بەلام بۆ ئەم شاعیرانەی لە سەرەتای تەمەنی شیعریاندان، لام وایە خوێندنەوەو موتالای شیعر لە هەموو شتێك پێویست ترە. چونکە خوێندنەوەی شیعر نەك هەر ئاسۆی خەیاڵ فراوان ئەکات، بەڵکو زمانی شاعیر لە رووی وشەو (تەعبیر)یشەوەو دەوڵەمەند دەکات. لەم رووەوە شیعری شاعیرە کلاسیکیەکان وەکو بنەمای یەکەم گرنگیەکی تایبەتیان هەیە. لە رووی ناوەرۆکیشەوە، چونکە لەوەی تا ئێستا شاعیرانی کورد لە ئاستی گەورەیی و سەختی ئەو کارەساتانەدا نەبوون کە لەم دواییانەدا بەسەر نەتەوەکەماندا هاتوون، هەروەها لایەنێکی گرنگیان فەرامۆش کردووە کە بە بیروڕای من پێویستی بە ئاوڕدانەوەیەك هەیە. ئەویش بریتیە لە مێژووی نەتەوەکەمان، مێژووی کورد پڕە لە قارەمانیەتی و لایەنی پرشنگدار کە ئەکرێ هەر یەکە لەوانە بکرێت بە هەوێنی داستانێك، جگە لەو هەموو تەجروبە دەوڵەمەندەی کە ئەتوانرێ سەدان پەندو دەرسی گەورەی لێ وەربگیرێت و لاوانی نەتەوەکەمانی پێ گۆش بکرێت.

**پرسیار/** هەندێ گۆڤارو رۆژنامە هەن، ئەمانەتی رۆژنامەگەری ناپارێزن و خۆیان چۆنیان بوێ ئاوا رەفتار دەکەن، هەر لەم روانگەیەشەوە ئێمە سەیری ئەو چاوپێکەوتنە دەکەین کە ژمارە (34)ی گۆڤاری (سروە) لە گەڵیاندا کردبوون، خۆتان لەو بارەیەوە چی دەفەرموون؟

**وەلام:** لە راستیدا ئەوە چاوپێکەوتن نەبوو. بەڵکو کۆمەڵێك هاتن بۆ لام بەمیوانیو گوتیان لەلایەن گۆڤاری "سروە"وە هاتووین. تەسجیلێکیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، وە دەستیان کرد بە پرسیار کردن. منیش پێشەکی پێم وتن ئەم قسانە بۆ بلاوکردنەوە نیە (هەروەها پاشتریش چەندین جار لێم دووبارە کردنەوە). خۆ ئەگەر هەر بڕیاری بلاوکردنەوەشیان دا، ئەبێ کە خستیانە سەر کاغەز بۆم بێننەوە بۆ ئەوەی پیا بچمەوە. پاش هەموو ئەمانەش یەك دوو جار بەبرادەرێکی خۆیاندا هەمان قسەم لێ دووبارە کردنەوە کەچی رۆژێك لە پڕ گۆڤاری "سروە"یان بۆ هێناوم و وتیان چاوپێکەوتنی تۆی تێدایە، بەلام ئەوەی لەمانەش سەیرتر بوو ئەوەبوو کە لەژێر ناونیشانی وەلامەکانی خۆمدا خوێندمەوە. جگە لەوەی بە ئارەزووی خۆیان قسەکانیان هەڵبژاردبوو شێوە زمانەکەیشیان گۆڕیبوو. بەجۆرێك کە من قەت بەکارم نەهێناوە. ئەمەش بەداخەوە نەك هەر بێ پەیمانی و دەرچوون بوو لەو مەرجەی کە من دام نابوو، بەڵکو دەرچوونیش بوو لە "ئەمانەتی رۆژنامەگەری". وەکو ئاشکراشە یەکێك لە بنەماکانی رۆژنامەگەری ئەمانەتە.

**پرسیار/** بەرێزتان یەکێکن لەو کەسانەی کە پەیڕەوی لەو زمانە سادەو گەشە کردووە دەکەن کە لە سەردەمی بابانەکانەوە بۆتە زمانی نووسین. حەتمەن ئەمەش بنچینەیەکی زانستیانەی هەیە، بۆیە تا ئێستا هەم ماوەتەوەو هەمیش روو لە گەشەکردنی بەردەوامە، بۆیە جێی خۆیەتی کە بپرسین:

أ–بۆ ئێوە پەیڕەوی ئەو زمانە دەکەن؟

ب–ئێستا هەندێ تەقەللای تاکەکەسی و دەزگای تایبەت هەن دەیانەوێ رەوتی ئەو زمانە یەکگرتووە بە ئاقاری تردا بەرن. ئێوە چۆن سەیری ئەو جۆرە تەقەللایانە دەکەن؟

ج–نەیارەکانی ئەم شێوە زمانە، پێیان وایە کە ئەم شێوە زمانە تایبەتە بە ناوچەیەکی جوگرافی بچووك و توانای تەنینەوەی باقی ناوچەکانی کوردستانی نیە.. حەزدەکەین باری سەرنجی ئێوە سەبارەت بەم مەسەلەیە بزانین.

**وەلام:** پێش هەموو شتێك بابزانین زمانی ئەدەبی چۆن دروست ئەبێت؟ ئەگەر چاوێك بەمێژوودا بگێڕین، بۆمان دەرئەکەوێ کە هەمیشە شێوە زمانێك کە هەلومەرجێکی رەخساو وای لێ بکا زاڵ بێ بەسەر شێوەکانی تردا، ئەو ئەو شێوە زمانە سەرکەوتووە، ئەبێ بەزمانی ئەدەبی وە یا وەکو پێی ئەڵێن "زمانی نەتەوەیی". بۆ نموونە زمانی ئەدەبی فەرەنسی بریتیە لە (لهجە)ی "پاریس"، وەهی ئینگلیزی بریتیە لە (لهجە)ی "لندن". هەروەکو زمانی ئەدەبی "ئیسپانی"ش بریتیە لە (لهجە)ی مەدریدی. هەروەها "لهجە"ی "سەکسونی" لە ئەڵمانیادا، وە "توسکانی" لە ئیتالیادا، کە هەلومەرجی سەرکەوتنیان بەسەر "لهجە"کانی تردا بۆ رەخساوە، بەزمانی رەسمی یا نەتەوەیی ئەو نەتەوانە ئەناسرێن. زۆر دووریش نەڕۆین، زمانی فارسی و عەرەبی بە نموونە بێنینەوە، "لهجە"ی "دەری "کە زمانی فارسی ئەمڕۆیە، بنەڕەتەکەی "لهجە"ی "خوراسان و سیستان و ماوارء النهر"ە. هەروەها زمانی عەرەبی، وە یا بڵێین زمانی نووسینی عەرەبی، هەمان شێوە زمانە کە "قریش" قسەیان پێ کردووە. ئەمە وەلامێکی کورت بوو بۆ تێکڕای پرسیارەکە. بەلام ئێستا بابێینە سەر یەك بەیەکی ئەو پرسیارە لاوەکیانەی کردووتانە. لە پرسیاری یەکەمدا ئەفەرموون: من بۆچی پەیڕەوی لەو زمانە ئەکەم کە لەسەردەمی بابانەکانەوە بۆتە زمانی نووسین؟ بەلای منەوە پێش خستنی ئەم پرسیارە زۆر بەجێیە. چونکە لە حاڵێکتان پرسیوە کە ئێستا "واقع" سەپاندوویەتی، من کە لەسەرەتای منداڵیمەوە "ساڵی 1930" چوومەتە قوتابخانە، بەم شێوەیە دەرسم خوێندووە، وەك کەوتووشمەتە خوێندنەوەی شیعر، ئەو دیوانانەم لەبەر دەستدا بووە کە بەم شێوە زمانە نووسراون. ئەمە هەرچەندە خۆی رووداوێکی زۆر گرنگ نیە، بەلام راستیەکی زۆر گرنگ دەرئەخات. ئەویش ئەوەیە کە منداڵانی کورد لە کوردستانی عێراقدا –شێوەی



کرمانجی ژووروی لیٚ دەرچیٚت– بەو شیٚوە زمانە دەرسیان خویٚندووەو پەروەردە بوون کە شاعیرانی ئەوەپیٚشیش شیعریان پیٚ وتووە. ئەم حاڵە لە بەشەکانی تری کوردستاندا نەبووەو نیە. لە کوردستانی تورکیا. لە (1925)ەوە کە (مصطفی کمال) دەستی کرد بە کۆچ پیٚ کردنی کورد، هەتا ئیمڕۆش بەکارهیٚنانی زمانی کوردی قەدەغەکراوەو بەهەموو شیٚوەیەك (محاربە) ئەکریٚ. ئیٚستاش گەلیٚك ناوچەی کوردستانی تورکیا، ناویٚرن بە کوردی قسە بکەن یاخود بەهۆی سیاسەتی (تتریك)ەوە لەبیریان چۆتەوەو نایزانن. لەبەرئەوە تەنانەت حیزبەکانیش گەلیٚك جار ناچار ئەبن بە تورکی بنووسن. چونکە ئەزانن کە خەڵکەکە زۆرتر لە تورکی تیٚئەگات. خۆئەگەر بیٚینە سەر کوردستانی ئیٚرانیش. ئەوا شتیٚکی ئاشکرایە کە لە زەمانی (ڕەزاشا)و کوڕەکەیدا، باوکیٚك نەیتوانیوە کاغەزیٚك بە کوردی بۆ کوڕەکەی بنووسیٚت، ئەمە هەر دوو بەشە گەورەکەی کوردستانە کە حاڵیان ئاوابووە. بەڵام لای ئیٚمە لە (کوردستانی عیٚراق)دا، شاعیران پەیتاپەیتا بەشیٚوە زمانەکەی (نالی) شیعریان وتوە کە لە کۆتایی میرنشینی بابانەوە سەری هەڵداوە. هەروەها لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عیٚراقەوە واتە لە (1921)ەوە هەتا ئیمڕۆ، جگە لە کتیٚبی قوتابخانەکان، سەدان کتیٚب و ڕۆژنامەو گۆڤار بەم شیٚوە زمانە بڵاوکراونەتەوە. وە لەوساوە هەتا ئەمڕۆ، پشتاوپشت لاوان بەم شیٚوە زمانە خویٚندنیان و وەرگرتوەو پیٚی پەروەردە بوون. وەنەبیٚ ئەمەش لە چالاکی دەوڵەتی عیٚراقەوە بیٚت، بەڵکو تیٚکۆشانی خەڵك و شۆڕشەکانی "شیٚخ محمود" لەلایەکەوە و بەڵیٚنی دەوڵەتی ئینتیداب (واتە ئینگلیز) و دەوڵەتی عیٚراق بە (عصبە الامم) لەسەر پاراستنی مافەکانی کورد لەلایەکی ترەوە، هەمووی هاتبوونە سەر ئەوەی کە خویٚندن لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا بەکوردی بیٚت.

سەرەڕای هەموو ئەمانەش ئەبیٚ بڵیٚم کە ئەم (لهجە)یە زمانی ماڵەوەم بووەو زمانی شیعریشم بەم شیٚوە زمانە پژاوە.

هەرچی بەشی دوومی پرسیارەکەتانە، واتە ئەوەی کە ئەڵیٚن: هەندیٚك دەسگاو کەس هەن کە ئەیانەویٚت ڕەوتی ئەم شیٚوە زمانە بە ئاقاری تردا بەرن، لە وەڵامی ئەمەدا هەر ئەوەندە ئەتوانم بڵیٚم کە ئەو جۆرە کەسانە، ئەو (واقع)ەی کە لەوەوپیٚش باسم کردن ئەکەن بە ژیٚر لیٚوەوە، ئەمەش هیچ بەرژەوەندییەکی نەتەوەیی کوردی تیٚدا نیە.

1)ئەو (واقعە)ی کە لە پیٚشدا باسمان کرد، وە بووە بەهۆی ئەوەی کە (لهجە)ی بابان لە کوردستانی عیٚراقدا ببیٚت بە (لهجە)ی نووسین و شیعر. وەنەبیٚ هەر تەنیا (واقیع)ی ئەمڕۆ بیٚت. بەڵکو میٚژوویەکی ڕابوردووشی لە پاڵدایە. ئەویش ئەوەیە کە قوتابخانەی (نالی) و (سالم) و (کوردی)، نەك هەر لە (سلیٚمانی) و (کۆیە) و (ڕەواندز) و (هەولیٚر)ەوە تا ئەگاتە گەرمیان پەلی کیٚشاوە، بەڵکو لە هەورامانەوە پەڕیوەتەوەو کاری کردۆتە سەر (موکریان) و قەلەمڕەوی (ئەردەڵان)یش. ئەمەش شتیٚکە بەزۆر نەسەپیٚنراوە. بەڵکو گەشەکردنیٚکی سروشتیە کەزۆربەی ڕۆشنبیرانی پیٚشوو تیٚی گەیشتوون. بۆ نموونە (تایەر بەگی جاف) وەکو گۆران بۆی باس کردبووم لەماڵەوە بەشیٚوەیەك قسەی کردووە کە زۆرتر لە (لهجە)ی (سنە)وە نزیکە. کەچی لە شیعرەکانیدا کتومت شیٚوە زمانی (نالی) و (کوردی) بەکارهیٚناوە. هەروەها (حاجی قادری کۆیی) و (شیٚخ ڕەزای تاڵەبانی)ش بەهەمان شیٚوە. ئەمانەش کەسیٚك زۆری لیٚ نەکردوون کە بەو شیٚوەیە بنووسن. بەڵکو خۆیان هەستیان بەوە کردووە کە (لهجە) تەنگەبەرەکەی خۆیان، لەکاتی شیعر وتندا فەرامۆش بکەن. هەروەکو فارسەکان ئەمڕۆ لە پاش (700) ساڵ پەیڕەوی لە شیعری (سعدی) و زمانی (سعدی) ئەکەن، بەبیٚ ئەوەی کەس زۆری لیٚ کردبن. لیٚرەدا پرسیاریٚك دیٚتە پیٚشەوە: بۆچی تایەر بەگیٚکی دەرەبەگ، ئەوەندە هەستی بە (مەسئولیەت) کردووە کە بەردیٚك بخاتە سەر ئەو بناغەیەی کە (نالی)و (سالم) دایان مەزراندووە، کەچی لاویٚکی ئەم سەردەمەی ئیٚمە هەست بەو مەسئولیەتە ناکات؟ وەڵامی ئەم پرسیارە گەلیٚك ئەنجامی تاڵ ئەگەیەنیٚت کە گرنگترینیان ئەوەیە کە ئەو ڕۆشنبیرەی ئەمڕۆ لە ئاستی ئەو (مەسئولیەت) و ئەرکە گەورانەدا نیە کە ئەکەویٚتە سەر شانی. هەڵبەت ئەبیٚ ئەوەشم لەبیر نەچیٚ کە لە حاڵەتی زمانی فارسیدا، لهجەکەی (سعدی) قەوارەیەکی (سیاسی)شی لە پشتەوە بووە. بەڵام پەیڕەوی کردنی ئەم شیٚوە زمانە، تەنها لە چوارچیٚوەی قەوارە سیاسیەکەدا باو نەبووە. بەڵکو خەڵکی لە دەرەوەی ئەم

قەوارەیەش هەر پەیڕەویان لەم شیٚوە زمانە کردووە. لیٚرەدا زۆرتر مەبەستم لەو نووسەرانەیە کە لەڕووی هەست بەمەسئولیەت کردنەوە (لهجە)یەك هەڵ ئەبژیٚرن نەك لەژیٚر گوشاری (سیاسی)دا.

2–ئاشکرایە کە کوردستان هەر پارچەیەی کەوتۆتە شویٚنیٚك، هەر پارچەیەی لەگەل نەتەوەیەکی تردا تیٚکەڵاوە کە زمانی لەگەل (کورد)دا جیاوازە. لەبەر ئەوە، (لهجەی) هەریەکیٚ لەو بەشانە، بەهۆی تیٚکەڵ بوونی لەگەل میللەتیٚکی جیاوازدا، تا بیٚت لە وانی تر دوور ئەکەویٚتەوە، خۆ ئەگەر نووسەرانی هەریەکە لەم شیٚوە زمانەش شیٚوەکەی خۆیان بکەن بەبناغە بۆ نووسینی ئەدەبی و شیٚوەکانی تر بخەنە پشت گویٚ لەوانەیە لەپاشەڕۆژیٚکی دووردا، هەریەکەیان ببیٚت بەزمانیٚکی سەربەخۆو دوور لەیەك میٚژووش گەلیٚك جار ئەم ڕاستی‌یەی سەلماندووە. بۆ نموونە: زمانی ئیتاڵی ئیٚستا بەجۆریٚك لەیەك دوور کەوتونەتەوە کە هەر یەکەیان بووە بەزمانیٚکی سەربەخۆی جیاواز، ئەوەش ئەگەڕیٚتەوە بۆ ئەوەی کە نووسەرانی هەریەکەیان بەشیٚوەی خۆیان نووسیویانە کەلە سەرەتادا تا ڕادەیەك نزیکی یەکتری بوون.

3–ڕەنگە یەکیٚك لەم قسانە واتیٚبگات کەمن ئەمەویٚ ئەم (لهجە)یەی ئیٚستا کەبەهەڵە پیٚی ئەڵیٚن (سۆرانی)، بەسەر خەڵکیدا بسەپیٚنم، بەڵام ئەم قسەیە ڕاست نی‌یە، چونکە وەکو لەوەپیٚش ووتم (خاڵی دوو) زمان بەزۆر ناسەپیٚنریٚ. کەواتە ئەبی مەبەستم چی بی؟ دیارە مەبەستم ئەوەیە کە لە (واقع)دا تاچ ڕادەیەك خۆی سەپاندووە، پیٚویست ناکات چەند (لەهجە) یەکی تەنگەبەری تری بۆ زیندوو بکەینەوەو بیکەین بە بەرهەڵست لەبەر دەمیدا بەڵکو ئەرکی نەتەوەیی و بەرژەوەندی نەتەوە ئەوەمان بەسەردا ئەسەپیٚنیٚت کە هەوڵ بدەین تا ئەتوانین ئاوو هەوایەکی گونجاوی بۆ بڕەخسیٚنین بۆ ئەوەی بتوانیٚ لەو ئاووهەوایەدا پەروەردەبیٚ و پەل بهاویٚژیٚ و سەقام گیر ببیٚت. شیٚوەو چونیەتی ئەم هەوڵ و تەقەلایانەش لیٚرەدا باس ناکریٚت. بەڵام من نووسیٚنیٚکی دریٚژم هەیە لەسەر مەسەلەی (زمانی ئەدەبی)و ئەو هەنگاوانەی پیٚویستن بۆ سەقامگیر کردنی ئەم زمانە، کەبە داخەوە تا ئیٚستا بڵاو نەکراوەتەوە. هیوادارم بتوانم کورتەیەکی بڵاو بکەمەوە.

لەبەشی سیٚهەمی پرسیارەکەتاندا ئەڵیٚن: نەیارەکانی ئەم شیٚوە زمانە، پیٚیان وایە کەئەم شیٚوە زمانە تایبەتە بە ناوچەیەکی جووگرافی بچووك‌و.. هتد، پیٚشتر دەرمانخست کەتینی ئەم (لەهجەیە) گەیشتۆتە گەلیٚك ناوچەی تری کوردستان (هەڵبەتە مەبەستم ناو خویٚندەوارانی ناوچەکانی ترە، چونکە ئەوەی لەپیٚشەوە حسابی بۆ دەکریٚت خویٚندەواری ناو خەڵکەکەیە). لەکاتیٚکدا ئەو کەسانە خۆیان هەندیٚك (لهجە)ی وا زیندوو ئەکەنەوە کە ڕچەکەی گەلیٚك تەنگەبەرترە، ئەمە لەلایەك. لەلایەکی تریشەوە ئەبیٚ ئەوەش بزانین، من کە ئەڵیٚم نابیٚ هیچ (لهجە)یەك بسەپیٚنین، مەبەستم ئەوە نی‌یە کەدۆش دابمیٚنین و دانیشین، وەچاوەڕوان بکەین تا یەکیٚك لەم شیٚوانە خۆی سەر دەکەویٚ. چونکە

قسەیەکی وا مەعنای ئەوەیە کە هیچ حسابێك بۆ ویستو ئیرادەی ئینسان نەکەین. ئالێرەدا ئەرکی خاوەن قەڵەمو ڕۆشنبیران دەرئەکەوێ. هەروەها ئەمە مانای ئەوەنی‌یە کە (لهجە)یەك کەلە (1921)ەوە پێ‌ی نووسراوە چەند پشت خوێندەواری پێگەیاندووە، بخەینە پشت گوێو (لەهجە)یەکی تەنگەبەری تر زیندووبکەینەوە کە نەکەس پێ‌ی نووسیوەو نەکارێکی بۆ کراوە.

لەکۆتایی بەشی سێهەمی پرسیارەکەتاندا ڕستەیەك هاتووە، کە گوایا نەیارەکانی ئەم (لهجە)یە ئەڵێن: (ئەم شێوە زمانە توانای تەنینەوەی باقی ناوچەکانی کوردستانی نی‌یە). ئەگەر مەبەستت لەتەنینەوە ئەوەبێت کە ئەبێت ئەم (لهجە)یە بەناو هەموو دەستەو چینەکانی کوردا بڵاوبێتەوە، ئەوا ئەم بۆچوونە پوێستی بەڕاست کردنەوەیەك هەیە. ئەویش ئەوەیە - وەکو لەپێشەوە وتم- پێشەکی ئەبێ ئەم (لهجە)یە لەناو ڕۆشنبیرانو خاوەن قەڵەمانی ناوچەکانی تردا بڵاوببێتەوە، نەك لەناو هەموو دەستەوچینەکانی نەتەوەدا. ئەمەیان لەهەنگاوی دواییدا پەیدا ئەبێ.

**<u>پرسیار /</u>** ئەوەندەی ئێمە ئاگاداربین ، گەورەترین پڕۆژەیەک کەبەشێک لەژیانی خۆتان بۆ تەرخان کردووە، کتێبی «عەرووز لە شیعری کوردیدا»یە.. پێمان خۆشە سەبارەت بەچۆنیەتی کەڵاڵە بوونو ئەنجام دانی ئەو پڕۆژەیە پوختەیەک بۆ خوێنەرانی گۆڤارەکەمان باس بکەن.

**<u>وەڵام:</u>** وەکو ووتم، سەرەتا (تا سالانی 65–67یش) هیچم لەعەروز نەزانیوە (کەچی زۆربەی شیعرەکانیشم عەروزین)، تەنها ئەوە نەبێت کەبەگوێ وەزنەکانم لەیەکتری جیا کردۆتەوە.. بەڵام لەگەڵ پەیدا بوونی شیعری تازەدا، هەسم ئەکرد کە هەندێك لەو شیعرانە، ناکۆك یەتە بەرگوێمو ئاوازەکەیان نارێکە. ئەمە وای لێ کردم لەخۆم بپرسم: کێش چی‌یە؟ هۆی نارێکی ئاوازی ئەم شیعرە تازانە چی‌یە؟ وە .. هتد. لەمەوە کەوتمە گەڕان بەدوای کێشی عەروزو بنەماکانیو جۆرەکانی. هەرچی کتێبەکەشە. بریتی‌یە لە (دراسە)ی شیعری تازە، هەروەها لەکۆتایی کتێبەکەدا، بەشێك تەرخان کراوە بۆ بەراورد کردنی (کێشی بڕگە)و(کێشی عەروون).

لەپێشەکی کتێبەکەشدا، بەدوور درێژی باسی چۆنیەتیو هۆیەکانی ئەو (دراسە)یەم ڕون کردۆتەوە.

**<u>پرسیار/</u>** ئەگەر ئیجازە هەبێت، حەز دەکەین شتێکمان سەبارەت بەئەزموونی خۆت وەک شاعیر، لەناو کاری سیاسیو حیزبایەتیدا بۆ باس بکەیت.. هەروەها شاعیر تا چەند لەناو چوارچێوەی ئیلتزاماتی سیاسیو حیزبیدا جێ‌ی دەبێتەوە؟

**<u>وەڵام :</u>** ئەوەی کەلەوەپێش باسم کرد، واتە مشتو مڕو (موناقەشە) لەگەل هاوڕێ چەپی‌یەکانمدا، لەسەر شیعری دڵداری، خۆی نموونەیەکە بۆ چۆنییێتی حیزبایەتی کردنی ئەو کەسانەو نەگونجانی من لەگەڵ ئەو جۆرە (ئیلتزام)انەدا. بۆیە زۆر جار لەو ڕووەوە ناکۆك بووین. کە شیعرێکم ئەنوسیو ئەوان بەدڵیان ئەبوو، زۆریان پی خۆش بوو،و بەگەرمی پیرۆز باییان لێ ئەکردمو. بەڵام کە شیعرێکم ئەنووسی بەدڵیان نەئەبوو، هەموو پێیان ئەووتم: تۆ چۆن ئەبێ وابڵێیت؟

بەکورتی ئەبی بڵێم: شاعیر ئەبی مولتەزیم بێت بە (قضیە)ی میللەتەکەیەوە بەڵام بەو مەرجەی کە ئەو (التزامە)ی بەسەردا نەسەپێنرێو خۆی ئازادانە هەڵی بژێرێت.

**<u>پرسیار /</u>** شوێنو ڕۆڵی شیعری کوردی لەم ڕۆژگارەدا، لەناو بزووتنەوەی ڕزگاری خوازی گەلەکەماندا چۆن دەبینن؟.. ئەرکو لێپرسراوێتی ئەدیب لە بەرامبەر ئەم بارە ئاڵۆزو سەختەی گەلەکەمانی تێدا دەژی چۆن تەماشا دەکەن؟

**<u>وەڵام:</u>** لەناو نەتەوەیەکی ژێر دەستەو بێکەسی وەکو ئێمەدا، شاعیرانو ئەدیبان بە گشتی، ئەرکێکی گرنگیان ئەکەوێتە سەر شان. ئەم ئەرکەش دوو لایەنی گرنگ ئەگرێتەوە لەلایەکەوە ئەبی شان بەشانی چەکی پێشمەرگە، هاوبەشی تێکۆشانی نەتەوەکەمان بکەنو بەهەموو توانیەکیانەوە گیانی بەرگریو شۆڕشگێڕی لەناو ڕۆڵەکانی نەتەوەکەماندا پەروەردەو بەهێز بکەن. چونکە تەنها لەئیسراحەتدا نووسین، کافی نی‌یە، لەلای دوومیشەوە، ئەبێ دەنگی هەقخوازانەی نەتەوەکەمان بگەیەنینە گوێ‌ی جیهانو تاوانەکانی داگیرکەران لەبەردەمی ڕای گشتی جیهاندا ریسوا بکەین. بەڵام بەداخەوە، ئەدیبانو شاعیرانی کورد لە ئاستی سەختی‌ی ئەو هەموو کارەساتە گەورانەدا نەبوون کە بەسەر نەتەوەکەماندا هاتووە، چونکە لەکاتێکدا کە ولاتەکەمان وێران کراوەو سەدان هەزار کورد دەربەدەر کراونو کوردستان تەعریب ئەکرێ با لەوانەش گەورەتر، لەکاتێکداکە شارێکی (70) هەزار کەسی بەبەرچاوی هەموو جیهانەوە، بە چەکی قەدەغەکراوی کیمیاوی شەهید ئەکرێ، ئەبووایە ئێستا سەدان(مەلحەمە)ی شیعریو شانۆی تراجیدیو ڕۆمانو.. بهاتایەبەرهەمو نەك هەر مێشکی لاوانی کوردیان بئاخنیایە، بەڵکو دنیایان لەهاوارو دەنگی کورد پڕ کردایە.

**<u>پرسیار /</u>** حەتمەن هەندێ بیرەوەری تایبەتیت لەگەڵ شاعیرانی سەردەمی خۆتان هەیەبەتایبەتیش شاعیرانی وەک گۆرانو بێکەسو شێخ نووری شێخ صالح، بۆیە ئەگەر مشتێ لەخەرواری ئەو بیرەوەریانەمان بۆ باس بکەیت، خۆش حاڵ دەبین،

**<u>وەڵام/</u>** بیرەوەری گەلێك زۆرەو گێڕانەوەی لێرەدا دوایی نایەت. بەڵام حەز ئەکەم شتێك لەسەر مامۆستا (بێکەس) بگێڕمەوە کەلەزمانی خۆیم بیستووە. ووتی جارێکیان لەبەغدا (خەڵەف شەوقی داوودی) هات بۆ لام وپێ‌ی ووتم با بچین بۆ لای (ڕەصافی)و (زەهاوی)و پێیان بڵێین ئێوە کە ئەسڵتان کوردە هیچ نەبێ شیعرێك بە کوردی بڵێن منیش رازی بوومو لەپێشەوە چوینە لای (زەهاوی)و پێم ووت: تۆ کورد نیت؟ ووتی: بەڵێ من کوڕی (مفتی زەهاوی)م لەئەسڵدا بابانین. پرسیم: ئەی بۆ بە عەرەبی شیعر ئەڵێیت؟ ووتی: چونکە پیاو بۆ نەتەوەیەکی زیندوو شیعر بڵێت چاکە. ئەوەتا من شیعر بۆ عەرەب ئەڵێم و قسەشیان پی ئەڵێم، کەچی هەر پێم ئەڵێن (استاذ).بەڵام تۆ شیعر بەکوردی ئەڵێیت پێت ئەڵێن (فایەقە کوێر). منیش ووتم: یەعنی جەنابت بۆ (مەنصەب)و پارە شیعر ئەڵێیت؟ ووتی: بەڵێ: ..جەنابت بۆ (مەجد)و شەرەف بیڵێ..

پاش ئەمە چووین بۆلای (ڕەصافی)، سەرەتا (خەڵەف شەوقی داوودی) منی (تەقدیم) کردو ئەویش زۆر بەڕێزەوە پێشوازی لێ کردین، بەڵام دوایی کە پێم ووت: تۆ کوردیتو بۆچی شیعر بەکوردی ناڵێ‌ی، پێ‌ی بڕیم ووتی : تکا ئەکەم شتی وا مەڵێ ئەگەر بۆ ئەمە هاتوویت، بزانە کە من عەرەبم.

گۆران –لە ساڵی (1959)دا لەسلێمانی دەورەیەکیان بۆ مامۆستایانی (زمانی کوردی)ی قوتابخانە سەرەتایی‌یەکانی کردووە، لەمەکتەبی (فەیصەلیە). منو کۆمەڵێکی تری وەکو (احسان فواد)و(فەرەیدون عەلی ئەمین)و(حمەسالح سەعید)، دانرا بووین (محاضرات) یان بۆبدەین لەسەر زمانی کوردی، منیش لەگەڵ بەڕێوەبەری (معاریف)دا ڕێکەوتم کە هەندێ شیعری (گۆران) یان بۆ شی بکەمەوە، وە بەتایبەتی شیعری (جوانی بێناو). بێگومان گۆران (کە ئەوکاتە لەسلێمانی بوو) ئەمەی بیستبوو. ڕۆژێك لەبەردەرکی سەرا. تووشی خۆی بووم پاش ئەحواڵ پرسی کەتینە قسەو کۆمەڵێکی تریش لێمان کۆبوونەوە وەکو هەندێ لە مامۆستاکانی تری دەورەکەو (عەلی شەونم)و شەهید (فەتاح



ئاغـا). لێـم پرسـی: بۆچـی نایـەیت گـوێ لـە قسـەکانم بگـری لـە سـەر شیعرەکەت؟حەز ئەکەم بۆ خۆت گوێت لێ بێتو ئەگەر ڕەخنەیەکیشت هەیە پێم بڵێیت. پی کەنیو، ووتیبیستومەو بیستووشمە کەباشی شەرح ئەکەیت. زۆریش حەز ئەکەم گوێم لێ بێت، بەڵام بۆم ڕێناکەوێت لەم بەینەدا، هەندی شتم لێ پرسی. پێشتر (موناقەشە) یەکم لەگەڵ (شەونم) دا بووبوو لەسەر دێڕە شیعرێکی گۆران:

هەر ئەوەندە گیرۆدەی گوڵی سووردبووم
نا شارەزاو پەپولەی دوور بەدوور بووم

من لام وابوو کە (ناشارەزا) ڕاست بێت، بەڵام عەلی شەونم ئەیوت: (تا شارەزا) ڕاستە. بەهەر حاڵ کە لە خۆیم پرسی ووتی: خۆی لەبنەڕەتدا (تاشارەزا)یە بەڵام (تا) لەبەر کێشی شیعرەکە فڕی دراوە. واتە (ناشارەزا)ماوەتەوە.

پاش ئەمە ووتم: باشە مامۆستا پرسیارێکی ترم هەیە. من لام وایە کە شیعرە سیاسیەکانی ئەم دواییەتان لەڕووی هونەری شیعریەوە، لە (مستەوای) شیعرەکانی ترتدا نین (موکو جوانی بێ ناو)، هۆی ئەوە چی‌یە؟ ووتی : تۆ چۆن وائەڵێی ؟ خەڵك زۆر لایان جوانە، ووتم: با واز لەخەڵك بهێنین، چونکە لای من ئەوە بڕاوەتەوە بەڵام ئێستا (هۆ) کەیم ئەوێ.. ماوەیەك مات بوو. پاشان ووتی: ئەوەی ڕاستی بێت، ڕەنگە ئەمە لەوەوە هاتبێ کە ئێستا زۆرتر کتێبی (ئیقتصادی)و (عیلمی)وەیا ئەوانەی کە زیاتر شێوەی (تەحلیلی عیلمی) یان هەیە ئەخوێنمەوە. ئەو جۆرە کتێبانە خەیاڵ تەسك ئەکەنەوە. خۆشت ئەزانی، شاعیر هەتا ئاسۆی خەیاڵی فراوانتر بێت شیعری باشتر ئەڵێت. (شێخ نووری)تازە (پێنج خشتەکی) یەکەم لەسەر شیعرەکەی خوالێخۆش بوو (شێخ نووری شێخ صالح) دانابوو، ڕۆژێك لە دوکانی برادەرێك یەکتریمان بینیو کەوتینە باسی شیعرو ئەدەب. پێی ووتم: ئەلێن تۆ شیعرێکی منت تەخمیس کردووە، حەز ئەکەم بۆم بخوێنیتەوە. منیش شیعرەکەم بۆ خوێندەوە. کەمێك بێدەنگ بوو، پاشان قەڵەمو کاغەزێکی دامێو، ووتی توخوا بەقەڵەمی خۆت بۆم نانووسی؟ منیش بۆم نووسییەوە.. لەم دواییانەدا، یەکێك لەوانەی کەخەریکی ساخ کردنەوەو ڕێکخستنی دەستنووسەکانی (شێخ نووری) بوو، وە گەلێك جار پرسو ڕای بەمن ئەکرد پێی ووتم کە ئەو دەستنووسەی منی لەناو شتەکانی (شێخ نووری)دا دیوەو (شێخ نووری) بەخەتی خۆی لەسەری نووسیوە تەخمیسی شاعیری ناسك حەیاڵ: (ئەحمەد هەردی).

<u>**پرسیار/**</u> ئایا لەگەل شاعیرانی عەرەبی عێراقی‌دا بیرەوەری واتان هەیە کە بکری بۆ خوێنەرانی باس بکەن؟

<u>**وەڵام:**</u> لەڕاستی‌دا ئاشنایەتیم لەگەل شاعیرانی عەرەبیدا کەم بووە. یەك دوو جارێك لەگەڵ (عبدالوهاب البياتی)دانیشتنمان بووە، هەروەها بەهۆی هاوڕێیەکی خۆمەوە ئاشنایەتیم لەگەل (بدر شاکر سياب)و (اكرم الوتری)دا هەبووە کە ئەمی دووەمیان شاعیرێك بوو کە ئێستا کەم ناوی ئەبیستم. ئەوسا دێوانێکی چاپ کراوی هەبوو (الوتر الجامد). بەلام زۆرتر لەهەموویان لەگەڵ (بدر)دا ئاشنا بووم. لەبیرم دێ جارێك دانیشتنێکی دوورو درێژمان پێکەوە کرد. ئەوجارە گەلێك لەشیعرەکانی خۆی بۆ خوێندمەوە. یەکێکیان مەلحەمەیەك بوو لەسەر (کۆریا) ، کە ئێستا لەناو شیعرەکانیدا ونە. پاشان داوای لێ کردم ئەگەر شیعری عەرەبیم هەیە ، بۆی بخوێنمەوە. منیش شیعری (صلوات المحب)م بۆ خوێندەوە. دوای ئەوەی شیعرەکەم بۆ خوێندەوە ، ووتی : تجربەی شیعری زۆری تێدایە. هەروەها جارێکیش بەهۆی (بدر شاکر سیاب)ەوە چوومە لای (جواهری) کە ئەوسا (الثبات)ی دەرئەکرد وە (بدر)یش نووسینی لەئینگلیزیەوە بۆ تەرجەمە ئەکرد.

<u>**پرسیار/**</u> بەحوکمی ئەو بارو دۆخە ناهەموارەی بەسەر گەلەکەماندا هاتووە، نووسەرانی کوردیش تووشی دابڕانو لەیەکتری دوورکەوتنەوە هاتوون ئینجا ئێوە چ ئامۆژگاریو پێشنیارێکتان لەو بارەیەوە هەیە؟

<u>**وەڵام :**</u> بەبڕوای من خاوەن قەڵەمەکان، زۆر ئیشیان پێ ئەکری بەخەڵکی تر ناکرێ ئەمەش (مبالغە نی‌یە). بەڵکو ئەگەر سەیری مێژووی میللەتان بکەین ئەبینین ئەو ژیارو (حضارە) و شارستانیەتەی کە هەیە، زۆرتری دەستکردی خاوەن قەڵەمەکانە.. ڕەنگە هەموو کەسێك ئەوە بزانێت بەبێ (فردوسی)و (سعدی)و (حافظ)، زمانی فارسی هیچ نرخێکی نەئەبوو. تەنانەت هەستی نەتەوەیی وزمانی ئەدەبی فارسیش قەرزاری ئەو سێ ئەدیبە گەورەیەن. ئەمەش شتێکە پێویستی بەسەلماندن نی‌یە. بۆیە لام وایە، کە ئەوانەی قەڵەمیان هەڵگرتووە، ئەرکێکی پیرۆزیان لەسەر شانە، بەمەرجێك لە ئاسۆیەکی ڕوانینی فراوانەوە سەیری مەسەلەی کورد بکەنو بەسنگێکی فراوانەوە گوێ لەیەك بگرن ئەگەر دەستەو تاقمەکانی تر چاویان لێ بپۆشری، ئەمان هەرگیز چاویان لێ ناپۆشرێ، ئەگەر نەتوانن خۆیان (وخەڵکیش)) بەرز بکەنەوە بۆ ئاستێکی فراوانتر دوور لە شەرە قۆچی حیزبایەتی و شەرە شەقی تەسك بینی.

بەبڕوای من کرنگترین شت ئەوەیە کە پێویستە لەم ڕۆژەدا پێش هەموو شتێك بەرژەوەندی نەتەوەیی کورد بەرچاو بخەن. کەزیاتر لە هەموو کاتێکی تر لە تەنگانە دایە. وەڵام وایە کە ئەمڕۆ، ئەرکی گەورەی سەرشانیان ئەوەیە کە نەك هەر هەموو ڕیزەکانی نەتەوەکەمان هۆشیار بکەنەوە، بەڵکو ئازارو ئاواتەکای کورد بگەیەننە هەموو دنیاش. جگە لەوەی کە پیرۆزترین وگەورەترین ئەرکی سەرشانیان ئەوەیە کە بە هۆشیاری و سنگێکی فراوانەوە تێ بکۆشن بۆ دروست بوون باخود ڕێگە خۆش کردن بۆ دروست بوونی زمانێکی نەتەوەیی ئەدەبی.

تێبینیەك لەسەر پرسیاری سێیەم:

پ: 3

*لەبەرئەوەی هیچ سەرچاوەیەکی وام لەبەردەستدا نی‌یە. لە بابەت ئەم شعرەوە پشتم بە (ذاکرە)ی خۆم بەستووە. بەڵام وا دەرئەکەوێ زۆر شتم لە بارەیەوە لەیاد چووبێ. بەڵام ئەوەندە هەیە Words Worth لە کاتی لاوێتیدا شیعرێکی بەناوی (قۆبەرە)وە نووسیوە. پاش (20) ساڵ. شیعرێکی تر بەهەمان ناونیشان واتە (قوبەرە) دەنووسی. جا ئەمە نەك هەر تەنها لای ئەم شاعیرە وایە، بەڵکو حالاتی واو لەمەش زیاتر لە شیعری شاعیرە "ڕۆمانتیکیە"کاندا ڕوویداوە، کە لە دەرفەتێکی تردا باسی دەکەم و نموونەی باشتریشی بۆ دەهێنمەوە ئەگەر ئەو سەرچاوانەی کە پێویستە دەستم بکەوێت.

*ئەم چاوپێکەوتنە لەلایەن برای شاعیر-محەمەد حەمە باقی-یەوە سازدراوە. لە گۆڤاری (نوسەری کوردستان) ژمارە (16)ی پایزیی 1989- دابلاوکراوەتەوە.





**مامۆستا ئەحمەد هەردی:**

**(کەڕازی ((دەم)) و ڕازی ((چاو)) یەك دەگرنەوە)**

**(( دەم ))ێ خواوەنـــدی دڵـــداری، بـــەگوێیا گـــەر بچرپێنـــێ،**
**مەگـــەر ئەوســـاتە بـــۆی بلـــوێ کەچـــەند ڕازێ.. بدرکێنـــێ..**

**بـــەڵام "چـــاو"ێ هـــەزارو یـــەك نـــهێنی تیـــا قـــەتیس مـــاوە،**
**ئەگـــــەر ڕازێکـــــی هـــــەڵبێنی، هـــــەزارت هەڵنـــــەهێناوە..**

**وەلی وێنـەی (( دەم )) و (( چـاو )) ێ کەهـــەردوو ڕوو لەیـــەکتر کـــەن**
**هـــــەموو ڕازێکـــــی درکـــــاوو نـــــەدرکاوی دەرون دەرخـــــەن؛**

**بـــــەواتا: ڕازو خوازێکـــــە، بەقـــــەت پانـــــایی دنیایـــــێ..**
**بـــــەواتا: عەشـــــقی دێرینـــــێ، کـــــەکۆتایی بـــــەهیچ نایـــــێ..**

لەندەن 1998/9/17

**تێبینی: ئەم شیعرە دوا بەرهەمی مامۆستای شاعیر (هەردی)یەو لەسەر داخوازی هونەرمەند کاك (ڕێبوار سەعید) نوسراوە.**
**شیعرەکە تایبەتە بە یەکێك لەتابلۆکانی پڕۆژەی (وشەو ڕەنگ)ی هونەرمەندی ناوبراو.**

مامۆستا ڕەئوف!

دوای هەموو شتێ هیوام وایە لەوەی بیبینیت دڵگیرتە بێ کە
پیشانم داوە. هەرچەندە دوور نیە هەندێکیشیان - بەتایبەتی ئەوانەی
کە تۆ ئەگەر لیستی خۆمم تیا پیشان داوە - ئەڵێم دوور نیە ئەوانەش
زۆریان وانەبن. وە ئەگەر چاوم بە خۆتان بکەوێ وە مەبەستی
ئەوەرباعیانەم [illegible] بەبێت، سەرێکم بگرێ.

هەرچۆنێ بێت، تێکڕا گەلێکیان جوانن وە گیانی [illegible] یان تیایە.
بەڵام داخەکەم من ئەم توانای یەك بە یەك لەسەریان بنووسم
وە ماهیەی جوانیان شرح بکەم، تەنیا ئەوەندە پیا گەیشتم
کە هەندێکیان سەرنجی ڕاکێشاوم، تەنیا لەوانە بێدەم کە لەم ڕووەکەوە
بە دڵم نین.

ئیتر چی بڵێم سەرکەوتنتان ئەکەم وە داوای لێبوردن

براتان،
ئەحمەد هەردی
١٩٧٧/١/١

# ژمارەی داهاتوو

# تایبەتە بە دەرهێنەری

# ناوداری سینەما

# یەڵماز گۆنای

